زنجیرەی : با چاکتر ئیسلام بناسین !
ئەڵقەی یەکەم

# خودا جَلَّ جَلالُه

نووسینی : عەلی باپیر

چاپی دووەم
١٤١٠ ك - ١٩٩٠ ز

زنجیرەی :

با چاکتر ئیسلام بناسین !

ئاڵقەی یەکەم

# خـــودا

سُبحانَهُ وَتعالیٰ

نووسینی : علی باپیر

١٤١٠ ک ـ ١٩٩٠ ز

چاپی دووەم

# پێشەکی

١- بەوانەی کە مەردانە هەوڵ دەدەن و شەوو ڕۆژان پێکەوە گرێ دەدەن ؛ هەرچی زیاترو چاکترو ڕاستتر لە ئیسلام تێ بگەن ، چونکە دەزانن کە هەتا بەچاکی ئیسلام نەناسن ، ناتوانن وەک پێویست بەرێوەی بەرن و کاری بۆ بکەن !

٢- بەوانەی کە بۆیە حەزدەکەن چاکتر لە ئیسلام حالی بن ، تا بتوانن زیاتر خزمەتی بکەن ، نەک خزمەتی خۆیانی پێ بکەن ، یان بە طاغووتانی بفرۆشن و دینی خۆیان بە دنیای خەڵکی بدەن !

٣- بەوانەی کە خوا لە زانیاری یەکەیانیان بەهرەمەندیان دەکاو ، هەتا ئاستی تێگەیشتن و شارەزاییان دەربارەی ئیسلام بەرزتر بێتەوە ، دڵیان ڕوونترو ڕەوشتیان بەرزتر دەبێ و ، چاکتر پابەند دەبن و پتر بەرەوخوا دەچن !

# پێشەکی

# پێناسەی ئەم زنجیرەیە

الحَمْدُ لِلّٰهِ رَبِّ العالَمِيْنَ وَالصَّلاةُ والسَّلامُ عَلىٰ مُحَمَّدٍ الأَمِيْنِ رَسُولِ اللّٰهِ لِلعالَمينَ وآلِهِ الطّاهِرِيْنَ وَصَحْبِهِ الأَكْرَمِيْنَ وَالمُهْتَدِيْنَ بِهَدْيِهِ المُبِيْنِ .

خوێنەری بەڕێزو خۆشەویستم !

سوپاس بۆخوا کە لە هەموو گۆشەو کەنارەکانی جیهانی پان وپۆڕی ئیسلامییەوە کاروانی جیهادو بووژاندنەوەی ئیسلام و نوێ کردنەوەی خەت و ڕێ و شوێنی پێغەمبەرمان علیه الصلاة والسلام کەوتۆتە ڕێ و، نیشتمانی کورد ( کوردستانی وێران و بێ شوان ) یش وەک پارچەکانی دیکەی ئەو جیهانە پان و بەرینە کەم و زۆر پشکی خۆی ڕەگەڵ ئەو کاروانە خستوە !

بەڵام گومانی تێدا نیە کە مەسلە بەس کارکردن و وەڕێ کەوتن و خۆماندووکردن نیە، بەڵکو ئەگەر بویستری کار ( عَمَل ) بەرهەمدار ( مُنْتِج ) بێت و، ڕێ بڕین بەئامانج گەیەنەر بێت، پێویستە هەر لەسەرەتاوە بەرنامەی جووڵان و کارکردن ئامادەو تەیارو ڕێبازی هەنگاوهەڵێنان و سەفەرکردن ئاچووخ و لەبەرچاو بێت .

ئەگەرنا هەرچەندە کاری زۆر بکرێ و ڕەنجی زۆر بدرێ و هەنگاوی زۆر بنرێ، سەرەنجام جگە لە ماندوبوون و ڕەنج

بەزا یەچوون و هیچ پێ نەبڕان و دەستلەبنی هەمبـــــانەوە دەرچوون و دووچاری ( بن بەست ) و بێ هیوایی بوون هیچی دیکە دەستگیر نابێت .

بەڵێ ئیشکردن و خۆماندووکردن بەبێ بەرنامەو ڕێبازێکی ڕاستو ڕوون ، وەک ئەوە وایە باباپەکی ڕێبوار ( مسافر ) بەپێچەوانەی لا ( جِهَة ) ی جێی ئامانج و مەبەستی یەوە هەنگاو بنێ ، کە دیارە هەتا زیاتر ئەقاوان هەڵێنـــــێ و خێراتر بڕوات زیاترو خێراتر لە مەنزڵ و ئامانجو مەبەستی وەدوور دەکەوێ ، ئەگەر گریمان ـ کە ئیحتیمالێکــــی زۆر دوورە ـ لە هیچ چاڵ و کەندالآنیش نەکەوێ !! (1)

هەربۆیەش خوای کاربەجێ بە پێغەمبەرمانی فەرمووە :

( .. لِكُلٍّ جَعَلْنا مِنْكُمْ شِرْعَةً وَمِنْهاجاً .. ) المائدة / ٤٨ .

واتە : بۆ هەرکامێکتان ـ لەو کۆمەڵ و ئۆممەتانە کــــە پێغەمبەرانیان بۆ نێرراون ـ ڕێبازو بەرنامەیەکمـــــان داناوە ..

هەروەها فەرموویەتی : ( ثُمَّ جَعَلْناكَ عَلىٰ شَرِيعَةٍ مِنَ الأَمْرِ فَاتَّبِعْها وَلاتَتَّبِعْ أَهْواءَ الَّذِيْنَ لايَعْلَمُونَ ) الجاثية / ١٨ .

واتە : پاشان تۆمان خستەسەر بەرنامەیەک لە ئاییـــــن ـ ی خۆمان ـ جا دوای بکەوەو مەکەوە شوێن ئارەزووەکانـــی ئەوانەی نازانن ..

---

(1) بێگومان شۆرش و ڕاپەرینە پەیتا پەیتاو بێ بەرهـــەم و هەرەس هێناوەکانی گەلی کوردیش گەورەترین و سەرەکی ترین هۆی تێشکان و هەرەس هێنانیان هەر ئەم هۆیەی سەرێ بووە ، کە ئێستا سەرنج دەدەین ئی وایان هەبووە ـ بەتایبەتـــی ئەوانەی ئەم دوایی یە ـ گەلی کورد زۆریشیان لەســـــەر قەرزدار بۆتەوە .

شاعیریش لەوبارەوە چاکی گوتوە :

تَرْجُوا النَّجاةَ ولَمْ تَسْلُكْ مَسالِكَهـــا
إنَّ السَّفِيْنَةَ لاتَجْرِيْ علىٰ اليَبَسِ

هەربۆیەش دەبینین مەگەر بەدەگمەن دەنا وشەی کردەوە ( عَمَلْ ) لە قورئانیدا قەت بەتەنیا نەهاتوەو هەموو دەمێ ( قَیْد ) ی چاک ( صالِحْ ) ی ڕەگەڵ خراوە !

کردەوەی چاک ( العمل الصالح ) یش وەک زاناو پێشەوایانی بیرتیژو دڵڕوونی پێشینمان فەرموویانە ، ئەوەیە کە سێ مەرجی تێدابێ :

١- بەپێی بەرنامەو شەرعی خودا بێت ، واتە لەسەر بناغەی پتەوی قورئان و سوننەت دامەزرابێ و لەبەر تیشکی فەرمانی خواو پێغەمبەرەکەی دا عَلَيهِ الصَّلاةُ والسَّلامُ بنیات نرابێ و بەڕێوەبرابێ ، نەک لەسەر زبڵدانی پیسی بیدعەت و کەندەڵانی هەڵواسراوی هەواو ئارەزوو ڕۆنرابێ !!

٢- بەس بۆخوا بێت ، واتە وەک ( شیر ) ێکی پاک بەهەوێنی خوا پێ مەبەست بوون ( الأخلاص ) مەیبێ و ، وەک نەمامێکی ساغ بە ئاوی شیرین و زوڵاڵی داواکردنی بەخشش و ڕەزامەندی خوا ( يَبْتَغُونَ فَضْلاً مِنَ اللّهِ وَرِضواناً ) ڕسقابێ و خەملابێت ، نەک بە چەنگەخۆڵی هاوبەش پەرستی ( الشِرْك ) پیس کرابێ و ، لەلایەن کرمی سەرنج ڕاکێشانی خەڵک ( الرِّياء ) ەوە کرمۆڵ بووبێ و کاری کرابێ !

٣- خاوەنەکەی بە لوتف و بەخششی خوای میهرەبانی لەقەڵەم بداتو ، زۆر چاک ویردی ( لاحَوْلَ وَلا قُوَّةَ إلّا بِاللّه ) لەسەر دڵ و زمانی سەقامگیر بووبێ ، نەک بە شان و شەوکەتی

خۆیەوە بنازێ و بە خەسڵەتی بەدی بەخۆنازین ( العُجْبْ )
خۆی گیرۆدەی تەڵەو داوی شەیتان و نەفس کردبێ .
بەڵێ خوێنەری خۆشەویست !
هەرکام لە "" ریابازی ( الرِّیاء ) و شتلەئاییـن دا
داهێنان ( الأبتداع ) و بەخۆنازین ( العُجبْ ) "" وەک کرمی
پیس و دەردی کوشندەو بێ شامان وان ، کە هەر کردەوەیەک
دووچاری هەر یەکێکیان ، چ جای هەرسێکیان ، ببێ، حەتمەن
حەتمەن ( قَیْد ) ی چاک ( صالِحْ ) ی لێ دەبێتەوەو دەبێتە
کردەوەیەکی خراپ ( عَمَلُ طالِحْ ) .
ئنجا بێگومان مەرجی یەکەم ، واتە بەرێوەچوون بەپێی
بەرنامەی خوا ( الأتبّاع ) ، مەرجی دووەم و سێیەمیش لەنێو
خۆی دەگرێ ، چونکە شەرع و بەرنامەی خوا و پێغەمبەری پێشەوا
عَلَیْهِ الصَّلاةُ وَالسَّلامُ فەرمانیان پێکردووین کە هەموشتێکمان
بۆخوا بێت ( .. فَاعْبُدِ اللَّهَ مُخْلِصًا لَهُ الدِّیْنَ . ألا لِلَّـهِ
الدِّیْنُ الخالِصُ .. ) الزُّمَرْ / ١ ، ٢ .
وە پێیان راگەیاندووین کە قەت بە کردەوەی چاکمان
خۆمان لێ نەگۆرێ و لەخۆ بایی نەبین ، چونکە مەگەر بە
لوتف و بەزەیی خوا دەنا کردەوەی هیچ بەندەیەک - تەنانەت
پێغەمبەریش علیه الصلاة والسلام - بایی ئەوە ناکات کە
پێی لە دۆزەخ قوتار بێت و پێی بچێتە بەهەشتـی ، وەک
پێغەمبەرمان صلی الله علیه وآله وسلم فەرموویەتی :
( سَدِّدوا وَقارِبُوا وَأَبْشِروا فَإنَّهُ لَنْ یُدْخِلَ أَحَداً الجَنَّةَ عَمَلُهُ ،
قالُوا : وَلا أَنْتَ یا رَسُوْلَ اللّهِ ؟! قالَ : ولا أَنـا إلّا
أَنْ یَتَغَمَّدَنِیَ اللّهُ بِرَحْمَتِهِ . ) متفق علیه .
هەڵبەتە ( عَطاء الله الأسکندري ) یش خوا لێی خۆش بێ

زانیویەتی چ دەڵێ کە فەرموویەتی :
[ وَمَعْصِيَةٌ أَوْرَثَتْ ذُلاًّ واحْتِقاراً
خَيْرٌ مِنْ طاعَةٍ أَوْرَثَتْ عِزّاً وَاسْتِكْباراً ]

بەڵێ ڕاستە سەرپێچییەک کە دەبێتە مایەی گەردن کەچی ئینسان و زەبوونیو خۆلەبەرچاو کەوتنی بەندە ، کە کاکڵی بەندایەتی ( عُبودِيَّة ) یە ، گەلێک چاکترو سەرەوخێرترە لە فەرمانبەری یەک کە دەبێتە زبڵدانی تیێدا تروکانی گەراو توخمی چەندان خەسڵەتی پیس و بەدی وەک خۆ لێ گۆڕان و لووت بەرزی و خۆهەڵکێشان و فیزو کەشخەو .. هتد کە بە ڕەگ و ڕیشەو بنجی خۆپەرستیو فیرعەونایەتی دادەنرێن !!
بەڵێ خوێنەری بەڕێز !
لە ڕوانگەی ئیسلامەوە هەر کردەوەو جموجۆڵ و چالاکسی و ڕەنجو تێکۆشانێک ببێتە هۆی لەخۆبایی بوون و خۆلێگۆڕانی ئینسان ، لەوەی هەرگەرێ کە بە چاک ( صالح ) دانانرێ ، بگرە خاوەنەکەی زۆریشی لەسەر قەرزدار دەبێتەوەو لەجیاتی چاکەو ( نِعْمَة ) بۆی دەبێتە بەڵاو ( نِقْمَة ) !!
کەواتە :
زۆر شتێکی گرنگ و پێویستە کە ئێمەی مسوڵمانانی خۆ بە ئیسلامی زان و ، ئێمەی هەڵگرانی ئاڵاو مەشخەڵی بووژاندنەوەی ڕێ و شوێنی پێغەمبەرو صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وآلِهِ وَسَلَّمْو هێنانەوە کایەی حوکمی ئیسلامو داگیرساندنەوەی چرای قورئان ، لەم سەرەتای دەست بەکاربوون و وەرێ کەوتنەوە ، هەتا دەتوانین هەوڵی پتر شارەزابوون و بەرچـــاو ڕوون بوونەوە بدەین ، بەهۆی زیاتر ناسینی ئیسلامەوە ، چونکە

ئاشكرایە کە بابای کوێر ئەوە هیچ کە ناتوانێ ببێتە (دەلیل) و ڕێ نیشاندەری کەس، بەڵکو بۆخۆشی ناگاتە مەنزڵ!

هەربۆیەش خوا بە پێغەمبەرمانی فەرمووە: (قُلْ هَـٰذِهِ سَبِيلِيٓ أَدْعُوٓا إِلَى ٱللَّهِ عَلَىٰ بَصِيرَةٍ أَنَا۠ وَمَنِ ٱتَّبَعَنِي ...) یوسف/ ١٠٨. واتە:

بڵێ: ئەمەیە ڕێبازی من، لەبەر ڕۆشنایی‌دا بانگەواز بۆلای خوا دەکەم، من و ئەوانەی شوێنم کەوتوون...

جا منیش وەک ڕێبوارێک لە ئەندامانی کاروانی ناوبراو، سەبارەت بەو مەسەلەیەی کە باسم کرد هەستم بە بەرپرسیاری کردو، لە کتێبخانەی کەم دەرامەتی کوردیش‌دا کەلێن و بۆشایی‌یەکی گەورەم هاتە بەرچاو، بۆیە ناوی خوام لێ هێناو عەزمم جەزم کردو بڕیارمدا، کە بەگوێرەی تواناو بڕستم لەو بوارەدا هەنگاوێک هەڵێنمەوەو نەختێک لەو کەلێن و بۆشایی‌یە زلە پڕبکەمەوە، ئیدی سەرەنجام ئەمامی ئەو هەست بە بەرپرسیاری کردن و ناوی خوا لێ هێنان و عەزم جەزم کردن و بڕیاردانە بە لوتف و بەخششی خوا لە زەوی واقیع‌دا ڕواو ڕسقاو ئەم زنجیرەی:

(با چاکتر ئیسلام بناسین!) ەی لێ ڕەخساو خەملا، کە ئومێدم وایە هەنگاوێکی چاک و سوودگەێن و بەرەوئامانج هێن بێ.

ئەم زنجیرەیەش تەرخان کراوە بۆ توێژینەوەو ڕوونکردنەوەی چەمک (مفهوم) و واتای (١٢) وشەو زاراوەی گرنگ و بنەڕەتی کە بە بەردی بناغەو پایەی سەرەکی ئیسلام لەقەڵەم دەدرێن، کە ئەمانەن:

( خودا ، پێغەمبەران علیهم الصلاة والسلام ، ڕۆژی دوایی ، قەزاوقەدەر ، بڕوا ، ئایین ، ژیانی دنیا ، ئینسان ، کۆمەڵی خوا ، حوکم و سیاسەت ، دادگەری ، مسوڵمانی کامڵ ) .

وە شایانی باسە بۆیە بۆ چاکتر ناسین و تێگەیشتنی ئیسلام ، لێکۆڵینەوەو ڕوونکردنەوەی مەعناو مەبەستی ئەم وشەو زاراوە گرنگ و سەرەکییانەم هەڵبژارد ، چونکە ناسین و لێ حاڵی بوونی هەر بەرنامەو پەیڕەوێک بەند ( مُعَلَّقْ ) ە بە ناسین و تێگەیشتنی ئەو وشەو زاراوە بنچینەییانەی کە بە کۆڵەکەو پایەی دادەنرێن و هێڵە گشتی یەکان ( الخُطوطُ العامَّة ) ی پێک دێنن .

گومانی تێدا نیە کە هەرکام لەم وشەو زاراوانەش کە هەر یەکێکیان ئاڵقەیەکی سەربەخۆی زنجیرەی :
( با چاکتر ئیسلام بناسین ! ) پێک دێنێ ، وەک پایەو بنچینەیەکی گرنگ و سەرەکی و هێڵێکی گشتی بیروباوەڕو بەرنامە ( العقیدة والشریعة ) ی ئیسلام و خەت و ڕێبازی پێغەمبەری پێشەوایە علیه الصلاة والسلام .

ئیدی هیوادارم و لە خوای بەخشەر داواکارم کە خوێنەرانی سەنگین و شیرین بە بیرێکی تیژو هۆشیارو دڵێکی ڕووناک و بێدارەوە موتالای یەک یەکی ئاڵقەکانی ئەم زنجیرەیە بکەن و تێیان بگەن ، پاشان هەر بەوەندەشەوە نەوەستن و دوای جێ بەجێ کردن و کارپێکردنیان لە زاتی خۆیان دا ، هەوڵی خەڵک لێ حاڵی کردن و چاککردن و واقیع پێ گۆڕینیان بدەن .

ئیتر دەست لە دەست و قوەت لە خودا جَلَّ جلالُه .

رَبَّنا لاتُزِغْ قُلُوبَنا بَعْدَ إِذْ هَدَيْتَنا وَهَبْ لَنا مِنْ لَدُنْكَ رَحْمَةً إِنَّكَ أَنْتَ الوَهّابُ .

٧ شعبان ١٤١٠

خدراوا

# چەند تێبینییەکی کورت

١- وام بەچاک زانی کە لە نووسینی بابەتەکانی هەموو ئاڵقەکانی ئەم زنجیرەیەدا بەگوێرەی توانا کورتیو چڕیو پڕی تەعبیر ڕەچاو بکەم ، ئەمە لەلایەکەوەو لەلایەکی دیکەشەوە من ئەم باسانەم بۆ تێکڕای خوێنەران نووسیون و ویستوومە ژمارەیەکی زیاتری خوێنەران لێیان بەهرەمەندبن، کەواتە با کەس گلەیی لە کورتیو زۆر ڕۆنەچوون و نەتوێژینەوەی تێروتەسەل نەکات .

٢- بەمەبەستی لێک نەپچڕانی زنجیرەی باسەکان ، ئەو ئایەت و فەرموودانەی کە بە بەڵگەو پاڵپشتی قسەکانم هێناومنەوە لە پەراوێزدا نووسیومن ، جا هەرچەندە ئەمە پێچەوانەی عادەت و یاسایە بەڵام ئەو هۆیەی کە خستمەڕوو ناچاری کردم وا بکەم .

٣- لەکۆتایی ئەم ئاڵقەیەو زۆربەی ئاڵقەکانی دیکەی ئەم زنجیرەیەدا باسێک یان چەند باسێکم بەناوی پاشکۆ ( مُلْحَق ) ەوە نووسیون ، کە دەبنە تەواوکەری ئەو باسانەی لە دەقی ئاڵقەکان دا نووسراون .

٤- من نە ئەم نووسراوەو نە هیچ نووسراوێکی دیکەشم بەو مەبەستە نەنووسیوە کە هەموو خەڵکی پەسندی بکەن و بە کارێکی چاکی بزانن ، چونکە ئاواتی گۆڕین لە دوو سەرەوە مەحاڵە :

یەکەم : بەس خوا لە هەڵەو ناتەواوی دوورەو جگە لەخوا جلَّ جلالُه هەموو کەس کەمو زۆر هەڵەو ناتەواوی لێ چاوەڕوان

دەکرێ ، کەچی خەڵک تەنانەت هەموویان لە خواش ڕازی نین !
دووەم : ئەم واقیعو بارودۆخەی کە من بە نووسین و وتارو کردەوە هەوڵی گۆڕین و چاککردنی دەدەم، زادەو بەرهەم و ڕەنگدانەوەی بیروبۆچوون و قەناعەتی کۆمەڵە خەڵکێکە ، کەواتە حەتمەن دەبێ من ئەوە لەخۆم بگرم کە لە دنیای فیکرو کردەوەدا لەگەڵ ئەو کۆمەڵە خەڵکە هەر تێک دەگیرێم، ئەو کەسەش کە گومانی وایە دەتوانێ واقیعێکی خوارو هەڵە بگۆڕێ و ڕاست بکاتەوە بێ ئەوەی لەگەڵ کەس تێک بگیرێ و کەس گلەیی‌و گازندەی لێ بکات ، من زۆرم بەزەیی پێدا دێتەوە، چونکە خەیاڵ پڵاوی کردوەو بە زمانی حاڵیش گومانی بەدی بەو پێغەمبەرە پایەبەرزو لێزان (حکیم) انە بردوە، کە چار ناچار لە گەرمەی گۆڕین و ڕاستکردنەوەی واقیعدا تووشی هەزارو یەک کۆسپ و تەگەرەو دەردەسەری بوون !!
بێگومان ئەوانەش کە هەر لە سەرەتاوەو پێش پێنجداکوتان و دەستەڵات پەیداکردن ، توانای ناسینی (هەق) یان هەیە یەکجار کەم‌و دەگمەنن و، ژیانی پێغەمبەری پێشەوا شمان علیە الصلاة والسلام چاکترین بەڵگەی سەلماندنی ڕاستی ی ئەم قسەیەو، تێوەڕامانێکی وردی :( إذا جاءَ نصرُ اللـهِ والفَتحُ . وَرأَيتَ النَّاسَ يَدْخُلونَ في دينِ اللَّهِ أفواجاً ) یش پتر ئەم مەسەلەیە دەکاتە شتێکی ئاشکراو بەڵگەنەویست .

# ڕێ خۆشکردن

مسوڵمانی بەڕێزو خۆشەویست !

وەک لە پێشەکی ئەم زنجیرەیەدا گوتمان :( .. ناسین و لێ حاڵی بوونی هەر بەرنامەو پەیرەوێک بەندە بە ناسین و تێگەیشتنی ئەو وشەو زاراوە بنچینەیی یانەوە کە بە کۆڵەکەو پایەی دادەنرێن و هێڵە گشتی یەکانی پێک دێنن ) .

بەڵێ خۆگۆڕین ( تَغْيِيرُ النَّفْس ) بنچینەی گۆڕینی واقیعە، وەک خودا فەرموویەتی :( .. إِنَّ اللّه لايُغَيِّرُ ما بِقَومٍ حَتّىٰ يُغَيِّروا ما بِأَنْفُسِهِمْ .. ) الرعد / ١١ . واتە :

.. بێگومان خوا حاڵ و واقیعی هیچ کۆمەڵێک ناگۆڕێ هەتا ئەوان حاڵی دەروونی خۆیان نەگۆڕن .. ، وە گۆڕینی بیروبۆچوون و جۆری تێڕوانینیش یەکەمین هەنگاو و بەردی بناغەی خۆگۆڕینە، چونکە وەک گوتراوە :( ئینسان چۆن بیربکاتەوە ئاواش دەژی ! ) .

ئنجا شایانی باسیشە کە ئەم واقیعو بارودۆخە نزم و پەست و سپات و بێ ڕووحەی ئێمەی مسوڵمانیش، کە بۆتە بەڵگەو بیانووی دەستی گەلێک کەسی لە ئیسلام بێ ئاگا ، بۆ بەهەڵەو ناتەواو لەقەڵەم دانی ئیسلامو لەبەرچاو بێزرانی، بەرهەمو ڕەنگدانەوەی حاڵەتی نزمو پەستو بێ ڕووحی دەروونیمانە کە دەتوانین بە وشەی :( لە ئیسلام دووری ی ) تەعبیری لێ بدەینەوە .

کەواتە :

ئەگەر بمانەوێ واقیعی ژیانمان لە شپرزەیی و زەبوونی و

نزمی‌یه‌وه بگۆڕین بۆ واقیعێکی ڕێک وپێک و شەڕافەتمەندانەو بەرز ، پێویستە دەروونی خۆمان بگۆڕین ، یەکەمین هەنگاوی خۆگۆڕینیشمان بریتیە لە گۆڕینی جۆری بیروبۆچــــــوون و تێڕوانینمان ، ئەمیش بەهۆی بەخۆداهاتنەوەو بەرەوخــوا گەڕانەوەو چاکتر ناسین و تێگەیشتنی ئیسلامەوە دێتەدی .

ئنجا وەک پێشتریش گوتمان بۆ چاکتر ناسین و لێ حاڵی بوونی ئیسلامیش بەر لە هەموو شتێک حەوجێمان بەوە هەیە کە بەشێوەیەکی ڕاست و ڕوون و ئاشکرا لە چەمک و مەعنــای ڕاستەقینەی ئەو وشەو زاراوە گرنگ و بنەڕەتی یانە حاڵــی بین کە بە کۆڵەکەو پایەو هێڵی گشتی لەقەڵەم دەدرێن ، گومانیشی تێدا نیە کە یەکەمین و گرنگترین وشەش لــــە ئیسلامدا بریتیە لە وشەی بەرزی خودا ( اَللّٰه ) جَلَّ جَلالُــه ، کەواتە جێی خۆیەتی کە توێژینەوەو ڕوونکردنەوەی مەعنــاو مەبەستی وشەی ناوبراو بکرێتە یەکەمین ئاڵقەی زنجیرەی : چاکتر ناسینی ئیسلام .

جا ئێمە خوا پشتیوان بێ بەئومێدی ڕوونکردنـــــەوەی حەقیقەت و مەبەستی ئەم وشە بەرزو پیرۆزو بەپێـــــزەو تۆزو گەرد لێ تەکاندنی و، ڕەواندنەوەی تەم و مژی ئــەو بیروبۆچوون و تێڕوانینە ئەفسانەیی‌یە بەناو ئاینی یانەی لێی هالاوە ، هەوڵ دەدەین کە لەم ئاڵقەیەدا لەبەر تیشکی قورئان و سوننەتان دا ، لە (١١) خاڵان دا بیروبۆچـــوون و تێڕوانینی مرۆڤی مسوڵمان لەوبارەوە بخەینەڕوو ، بــــەڵام سروشتی ئەم زنجیرەیە وا داخواز دەکات کە بەپێی توانــا کورتی‌و پوختی تەعبیر ڕەچاو بکرێ ، جا لەسۆنگەی ئەمــەوە هیوادارم خوێنەری خۆشەویست لە دەمی موتالاکردنی ئـــەم

ئاڵقەیەو ئاڵقەکانی دیکەی ئەم زنجیرەیەشدا هێندی و ئارامۆ ورد بیو لە لاپەڕە ژماردنێ بەپەلە نەبێ .

دیارە ئەو کەسەش کە هەروا بە سادەییو سەرکێڵی سەرنجی دەریا دەدات بەس ئاوێکی شینی داوەستاو بەدی دەکاتو هیچی دی ! بەڵام ئەگەر تۆزێک بچێتە پێشترو وردتر سەرنجی بدات چەندان گیاداری جۆراوجۆری تێدا بەدی دەکات ، خۆ ئەگەر بتوانێ خۆی تێدا نقووم بکاتو بنەوەی بپشکنێ ئەوە چەندان گەوهەرو مرواری و شتی دیکەشی تێدا دەبینێ .

- ١ -

# خوا بەدیهێنەرو پەروەردگارە

مرۆڤی مسولمان بڕوای وایە کە ئەم بوونەوەرەو هەرچی تێیدایە پەرێزو شوێنەواری خوایەکی بەدیهێنـــــەرو (١) پەروەردگارە (٢) ، کە لەئەنجامی سۆزو بەزەیی و چاکەکاری خۆیەوە هێناویەتەدی (٣) . بەپێچەوانەی باباى ماددەپەرست و

---

(١) ( اللَّهُ خالِقُ كُلِّ شَيءٍ ) الزمر / خودا بەدیهێنەری هەمـوو شتێکە .

(٢) ( قُلْ أَغَيْرَ اللَّهِ أَبْغِي رَبًّا وَهُوَ رَبُّ كُلِّ شَيءٍ ) الأنعام / ٦٠. بڵێ : ئایا جگە لە خوا پەروەردگارێکی دی بخوازم کە ئەو پەروەردگاری هەموو شتێکە ؟!

(٣) ( الرَّحْمٰنِ الرَّحِيمِ ) الفاتحة / ٣ . بەبەزەیی بەخشندەیە .
( ورحمتي وَسِعَتْ كلَّ شيءٍ ) الأعراف / ١٥٦ . بەزەیی من هەموو شتێکی گرتۆتەوە .

تێبینی یەکی گرنگ :

ئەم رستەیە ( کە لەئەنجامی سۆزو بەزەییو چـــاکەکاری خۆیەوە هێناویەتەدی . ) وەڵامێکی بەهێزو ددان شـــکێنی تێدایە ، بۆ پرسیارێک کە دڵی هەندێک کەسی بێ بـــڕواو خوانەناس ـ یان خۆ بەخواناس پێشاندەر ـ ی کرمـــێ و گوماندار کردوە !

پرسیارەکەش ئەمەیە :

بێگومان ئێوە دەڵێن خوا حەوجێی بە غەیری خۆی نیـــە ، چونکە خوا خاوەنی هەموو سیفەتێکی بەرزو پەسندەو لە هەموو سیفەتێکی نزمو کەمو کووری یەک دوورە ، باشە ئەدی مادام خوا پێویستی بە بوونەوەر نیە بۆچی خوڵقاندوویەتی ؟!

حەتمەن ئێوەی خواناس ناچارن لە دوو شتی خراپ یەکێکیــان هەڵبژێرن ، یان دەبێ بڵێن : خوا حەوجێی بوونەوەر بـــوو

بۆیە هێنایەدی ، یان بڵێن : خوا پێویستی بە بوونەوەر نەبوو بەڵام هەروا لەخۆڕاو بێ حیکمەت و هۆ خولقاندی !!

دیارە هەردووکیشیان یەک لەیەکی خراپترن ، چونکە یەکەمیان ئاتاجیی پاڵدەداتە لای خواو ، دووەمیشیان نەزانیی و بێ حیکمەتیی و کاری بێ جێ کردن !!

ئێمەش لە وەڵامدا دەڵێین :

نەخێر ئێمە بۆ وەڵامی پرسیاری ( خوا بوونەوەری بۆ خولقاند ؟! ) ناچارنین کە حەتمەن یەکێک لەو دوو ڕێ یە خوارو خێچ و نالەبارەی سەرێ هەڵبژێرین ، بەڵکو ڕێ یەکی دیکەی سێیەمی لەبارو تەخت و ماقووڵ هەیەو ، هەتا ڕێ ی ڕاست و تەختیش هەبێ کابرا مەگەر خوا لێی گۆڕیبێ یان کەری دێزە بێ ، دەنا پێویست ناکات وەڕێی عاسێ هەڵگەڕێ و ملی تەلانیی لابەلا بگرێ !!

ئێمە دەڵێین :

ئایا مەرجە ئەگەر هەرکەسێک کارێک بکات حەوجێ ی نەبێ و بۆخۆی سوودی لێ وەرنەگرێ حەتمەن بە کارێکی بێجێ و ناحەکیمانە لەقەڵەم بدرێ ؟!

دیارە نەخێر ، چونکە ئەو کارانەی ئەنجام دەدرێن مەرج نیە هەموویان هەر پاڵنەری حەوجێیی و پێویستی پێ بوون و سەرتێ وەستان و پەک لەسەرکەوتن بیان هێنێتەدی ! ئایا تۆ لەکاتێک دا بەلای سواڵکەرێکی هەژارو بێ دەستدا ڕەت دەبی و دەست دەبەیە باخەڵێ ( دینار ) ێکی دەدەیە بۆیە دەیدەیە چونکە سەرت تێی وەستاوەو پێویستیت پێیەتی ؟!

دیارە نەخێر ، ئەدی چ شتێک پاڵت پێوەدەنێ یارمەتی بدەی ؟ دیارە بەزەیی پێداهاتنەوەو دڵ پێ سووتانت !!(١)

دە بەهەمان پێودانیش ، خودا سبحانە وتعالی هیچ

---

(١) بۆیە ڕووی قسانم لە باباى دوێنراوو خاوەن پرسیارە ، چونکە ئەو بڕوای بە دوارۆژیش نیە تاکو بگوترێ : بۆیە کابرای بەخشەر ماڵەکەی دەبەخشێ و یارێدەی نەدارێکی پێ دەدات چونکە حەوجێی پاداشتی خودایە لەبەهەشتێ دا ، بەڵکو ناچارین بڵێین : هاندەرو پاڵنەری ئەو پارە بەخشینەی کابرای بێ بڕوا ، بەس بەزەیی پێداهاتنەوەو دڵ پێ سووتانە .

پێویستی‌یەکی بە ئێمە نیەو پەکی لەسەرمان نەکەوتووە ،
بەڵکو ئێمە هەمووماں حەوجێو چاولەدەستی وین وەک
فەرموویەتی : ( يا أيها الناس أنتمُ الفقراء إلى الله
والله هو الغَنيُّ الحَميدُ ) الفاطر / ١٥ . واتە :
ئەی خەڵکینە !

ئێوە حەوجێی خوان و خودا بۆخۆی دەوڵەمەندی سوپاس کراوە .

بەڵێ خودا نە ئێمەو نە هیچ شتێکی لە بوونەوەردا نەخولقاندوە ، بۆ ئەوەی مەداریکی خۆی پێ سازبکات و کەلێنێکی پێ پرەوکات !!

ئەوە لەلایەکی دیکەشەوە وەک روونمان کردەوەو سەلماندمان مەرج نیە ئەو ئیش و کارانەی ئەنجام دەدرێن مادام بە پاڵنەری ئاتاجیو پەک لەسەرکەوتن نەیەنەدی بێ حیکمەت و نەزانانە بن ، بەڵکو جاری وایە نەک خودا جَلَّ جَلالُه تەنانەت مرۆڤیش هەندێک کاران دەکات هیچ پێویستی بەو کارانە نیەو ئەوپەڕی حیکمەت و لێزانیشیان تێدایە ، کە بریتی‌یە لە یاریدەدانی فەقیرو دەستگرتنی و بەهاناوەهاتنی بە پاڵنەری چاکەکاری و بەزەیی و بەخشندەیی !!

کەواتە خوداش کە ئێمەو بوونەوەری خولقاندوە ، نە سەرتێ وەستان و پێویستی پێ بوون و ، نە بێ حیکمەتی و هەوەنتەکاری ، شتاقیان لەگۆڕێ دا نەبوون ، بەڵکو بەس ئەوە لەگۆڕێ دا بووە کە خودا ( رَحْمن رَحيم ) ەو خاوەنی ئەوپەڕی میهرەبانی‌و بەخشندەیی‌و چاکەکاری یەو ، ئنجا هەموو جۆرە بەزەیی نواندن و چاکەکاری یەکیشی لەدەست دێو ویستوویەتی چاکەمان لەگەڵ بکاو لە رووی لوتف و بەزەیی‌یەوە لە سەرچاوەی روونی بوون ( الوجود ) بەشمان بدات .

بێ باوەڕەوە کە پێی وایە بوونەوەر شاری بێ ساحێبـــەو نە کەس دروستی کردوەو نە کەسیش مشووری دەخواو بەسەری ڕادەگا (١) ، وە بەپێچەوانەی ئەو فەیلەسووفە کەللە وشک و دڵ مردووانەوە کە بەس وەک وەگەڕخەرو دروستکەرێک سەیری خودا دەکەن و زیاتر وەک وەستاو ئەندازیارێک لەخــواوە ڕادەمێنن ، هەتا خوایەکی بەخێوکەرو پەروەردگارێکی بەسۆزو بەخشندە .

---

(١) ( وما خَلَقْنا السَّماءَ والأَرْضَ وما بَيْنَهُما باطِلاً ذلِكَ ظَنُّ الذين كفروا ... ) ص / ٢٧ .
وە ئاسمان و زەوی و ئەوەی نێوانیانمان بە بــــەلاش دروستنەکردوون ، ئەوە گومانی ئەوانەیە کە کافرن ...

# خوا تاك و تەنیاو بێ وێنەو هاوتایە

مرۆڤی مسوڵمان بڕوای وایە خوای میهرەبان تــاک و تەنیایەو هەموو شتێک حەوجێی وی یەو ئەو حەوجێی هیچ شتێک نیە ، کەسی لێ نەبووەو لە کەسیش نەبووە بێ وێنــەو هاوتایە ،(١) نە لە زاتی دا نە لە سیفەتەکانــی دا وەک هیچ کام لە دروستکراوەکانی ناچێ ،(٢) هەربوو و ( أزلي)و بێ سەرەتایەو، هەرماو ( أبدي ) و بێ کۆتایە .(٣)

نەک وەکو ئەفسانەی ئیغریقی کە بۆ هەرکام لە دیاردە سروشتی یەکانی وەک : با ، باران ، ئاگر ، هەور ، لافــاو ، برووسکە .. هتد خوایەکی تایبەتی بڕیاردەدات . وە نــەک وەک ئەفسانەکانی کلێسای کلێس کە منداڵ و هاوسەر بۆخوا دادەنێو عیساو دایکیشی سەلامی خوایان لێ بێ بە دوو خوای

---

(١) ( قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَد . اللَّه الصَّمَدُ . لَمْ يَلِدْ وَلَمْ يُوْلَــد . وَلَمْ يكن لَهُ كفواً أحَد ) الأخلاص / واتە : بڵێ : ئــەو خوایەکی تاکە ، خوایەکە هەموو شتێک حەوجێیەتیو ئــەو حەوجێی کەس نیە . کەسی لێ نەبووە، لەکەسیش نەبووە ، وە هیچ کەس هاوتای وی نیە .

(٢) ( لَيْسَ كمثلهِ شَيْءٌ ) الشورى / ١١ . هیچ شتێک وەک وی نیە .

(٣) ( هو الأول وَالآخِرُ ) الحدید / ٣ . ئەو یەکەمین و دوامینە ، یانی نە لەپێش وی دا هیچ هەبووە ، نە لەدوای وی هیــچ دەبێ .

دیکە لەقەڵەم دەدەن ،[1] وە نەک وەک جوولەکەکان کە منداڵ بۆخوا بریار دەدەن و زیاتر وەک ئینسان سەیری دەکەن .[2] وە نەک وەکو زەردەشتی یەکان کە ڕووناکی بە خوای خێر ( یەزدان ) و تاریکی بەخوای خراپە ( ئەهریمەن ) دادەنێن .

---

(١) ( لَقَدْ كَفَرَ الَّذِيْنَ قالُوا إِنَّ اللَّهَ ثالِثُ ثَلاثَةٍ ..) المائدة ئایەتی / ٧٣ .
بێگومان ئەوانەی دەڵێن : خوا سێیەمی سێیەکانە کافرن .

(٢) ( وقالَتِ اليَهُودُ عُزَيْرٌ ابْنُ اللَّه ... ) التوبة / ٣٠ .
وە جوولەکەکان گوتیان عوزەیر کوڕی خوایە .

## -٣-

# خوا خاوەنی هەموو سیفەتێکی بەرزو پەسندەو لە هەموو لەکەیەک دوورە

مسولمان بڕوای وایە کە خوای دەسەڵاتدارو بەخشندە خاوەنی هەموو سیفەتێکی بەرزو چاک و پەسندەو [1] لە هەموو سیفەتێکی ناتەواوو خراپ بەری یەو هەتا بڵێی پاک و بێ گەردە ، [2] وە بڕوای وایە کە سیفەتە بەرزو پەسندەکانی خوا دیاری کراو نین و بێ سنوورن ، واتە خوا هەموو شتێک دەزانێ و ، [3] توانای بەسەر هەموو شتێک دا دەشکێ و [4]

---

(١) ( ولَهُ الحَمْدُ في السَّمٰواتِ وَالأَرْضِ .. ) الروم / ١٨ . وە هەرچی لە ئاسمانەکان و زەوی ـ بوونەوەر ـ دا هەیە سوپاس و ستایشی خودا دەکات .
تێبینی : هەڵبەتە ئەگەر خودا خاوەنی ئەوپەری سیفەت بەرزی و ئاکارپەسندی نەبایە لەتێکرای بوونەوەردا سوپاس نەدەکرا ، چونکە بەبێ چاکی و پەسندی سوپاس بۆکران نایەتەدی .

(٢) ( تُسَبِّحُ لَهُ السَّمٰواتُ السَّبْعُ والأرضُ ومَنْ فيهِنَّ وإنْ مِنْ شَيءٍ إِلاّ يُسَبِّحُ بِحَمْدِهِ ) الأسراء / ٤٤ . حەوت ئاسمانەکان و هەرچی تێیان دا هەیە پاکی بۆوی بڕیاردەدات ، وە هیچ شتێک نیە کە پاکی و پەسندی وی ڕانەگەیەنێ .

(٣) ( إِنَّ اللّهَ لايَخفىٰ عَلَيْهِ شَيءٌ في الأَرْضِ ولا في السَّماءِ ) . آل عمران / ٣ . خوا هیچ شتێکی لێ ون نابێ ، نە لە زەوی و نە لە ئاسمانێ .

(٤) ( إِنَّ اللّهَ عَلىٰ كُلِّ شَيءٍ قَديرٌ ) البقرة / ٢٠ . بەڕاستی خوا لەسەر هەموو شتێک بەتوانایە .

هەرچی بیەوێ دەیکاو (١) هیچ شتێک نیە نەیبینێ و نەیبیستێ ، (٢) وە خوای مەزن ژیانی لەخۆیەوەیەو ئەو ژیان بەغەیری خۆی دەبەخشێ . (٣) وە گۆیایەو قسەی وی بێ هاوتایە لە ڕاستیو ڕەوانیو ڕێک وپێکی دا ، (٤) وە خوای بێ هاوەڵ ئەوپەڕی بەزەییو لێبوردن و بەخشندەیی هەیەو (٥) تووڕەییو قەهریشی هیچ شتێک خۆی بۆ ڕاناگرێ ، (٦) وە دادگەری و (٧) کاربەجێیی (٨) خودا وێنەی نیە .

---

(١) ( فَعّالٌ لِما يُرِيدُ) البروج/١٦. هەرچی بیەوێ دەیکا .
(٢) (وهُوَ السَّمِيعُ العَلِيمُ) الشوریٰ /١١. وە ئەو بیسەرو بینایە .
(٣) ( الحَيُّ القَيُّومُ ) البقرة /٢٥٥. زیندوویەو سەرپەرشتیکەرە .
(٤) ( وَتَمَّتْ كَلِمَةُ رَبِّكَ صِدْقاً وعَدْلاً ) الأنعام / ١١٥ .
وە قسەی پەروەردگارت لەوپەڕی ڕاستیو ڕێک وپێکی دایە .
(٥) ( وكانَ اللهُ غفوراً رَحِيماً ) الاحزاب / ٥٩ . وە خودا لێبوردەو بەبەزەییە .
( الرَّحمٰنِ الرَّحيم) الفاتحة/٣. بەبەزەیی بەخشندەیە .
(٦) ( هُوَ اللهُ الواحِدُ القَهّارُ ) الزمر / ٤ . ئەو خودایەکی تاک و دەستەلاتدارە .
( إن الله عزيزٌ ذو انْتِقامٌ ) إبراهيم / ٤٧ . بەڕاستی خودا دەستەلاتدارو تۆڵە ئەستێنە .
(٧) ( أَلَيْسَ اللهُ بأَحْكَمِ الحاكِمِينَ؟!) التين / ٨ . ئایا خودا دادگەرترینی فەرمانرەوایان نیە ؟!
(٨) ( لا إله إلا هُوَ العَزيزُ الحَكِيمُ ) آل عمران / ١٨ .
بێجگە لەوی چ خوا نین ، دەستەلاتدارو کاربەجێیە .
( والله عَلِيمٌ حَكِيمٌ ) النور / ١٨ .
وە خوا زاناو کاربەجێ یە .

-٤-

# خوا خاوەنی چەند ناوێکە کە چاکترین و تەواوترین ناون

مرۆڤی مسوڵمان بڕوای وایە کە خوای پەروەردگار خاوەنی چەند ناوێکە ،(١) ئەو ناوانە بەرزترین و تەواوترین ناون و پێویستە مرۆڤ بەس بەو ناوانە بانگی خودا بکات و لەبەری وەپاڕێ و هیچ ناوێکی دیکەی لێ هەڵنەدات ،(٢) هەڵبەتە ئەو ناوانەش هەرکامێکیان درووشم و نیشانەی یەکێک لە سیفەتە تەواوو بەرزەکانی خودان .

---

(٢) ( وَلِلَّهِ الأَسْمَاءُ الحُسْنىٰ فَادْعُوهُ بِهَا وَذَرُوا الَّذِينَ يُلْحِدُونَ فِي أَسْمَائِهِ ) الأعراف / ١٨٠ . وە خودا ناوی چاک و پەسندی هەن بەو ناوانە بانگی بکەن وە واز لەوانە بێنن کە لە ناوەکانی لادەدەن و دەیان گۆڕن .

(١) پێغەمبەری پێشەوامان عَلَيْهِ الصَّلاةُ والسَّلامُ فەرموویەتی : ( إِنَّ لِلَّهِ تَعالىٰ تِسْعَةً وتِسْعُونَ إِسْمًا مائَةً إِلاَّ واحداً ، مَنْ أحصاها دَخَلَ الجَنَّةَ ، إِنَّهُ وِتْرٌ يُحِبُّ الوِتْرَ ) رواه الشيخان . واتە : بێگومان خوای بەرز نەوەدو نۆ ناوی هەن ، سەد جگە لە یەکێک ، هەرکەسێک بیان ژمێرێ دەچێتە بەهەشتێ ، بێگومان ئەو تاقەو تاقی خۆش دەوێ .

ئنجا پێغەمبەرمان عليه الصلاة والسلام لە فەرموودەیەکی دیکەی دا کە ( ترمذي و ابن حبان و ابن خزيمة و حاكم و بيهقي و ابن ماجة ) گێراویانەتەوە ئەو (٩٩) ناوەی باس کردوە کە ئێمە لێرەدا دەیان نووسین و بەکوردیش مەعنایان لێک دەدەینەوە :

( هُوَ اللَّهُ الذي لا إِلَهَ إِلاَّ هُوَ :

| | |
|---|---|
| ١ـ الرَّحمٰن | بەبەزەیی |
| ٢ـ الرَّحیم | بەخشندە |
| ٣ـ المَلکُ | سەرۆک ، پادشا |
| ٤ـ القُدّوس | پاک |
| ٥ـ السَّلام | بێ عەیب ، بێ پەڵە |
| ٦ـ المُؤمن | دڵنیاکەر ، بەڕاستدانەر |
| ٧ـ المُهَیْمِنْ | بەسەر ڕاگەیشتوو |
| ٨ـ العَزیْز | زاڵ ، دەسەڵاتدار |
| ٩ـ الجَبّار | بالادەست ، ناچارکەر |
| ١٠ـ المُتَکَبِّر | خۆبەگەورەزان |
| ١١ـ الخالِق | دروستکەر ، بنیاتنەر |
| ١٢ـ البارِئ | بەدیهێنەر |
| ١٣ـ المُصَوِّر | وێنەکێش |
| ١٤ـ الغَفّار | لێبوردە |
| ١٥ـ القَهّار | گەردن کەچکەر |
| ١٦ـ الوَهّاب | بەخشەر |
| ١٧ـ الرَّزّاق | ڕۆزی دەر |
| ١٨ـ الفَتّاح | دەرووکەرەوە |
| ١٩ـ العَلِیم | زانا |
| ٢٠ـ القابِض | لێگرەوە ، وێکهێنەر |
| ٢١ـ الباسِط | لەدوودەر ، فراوانکەر |
| ٢٢ـ الخافِض | دانەوێن ، نەوی کەر |
| ٢٣ـ الرافِع | بڵندکەر ، بەرزکەرەوە |

.........................................................................

| | |
|---|---|
| ٢٤ـ المُعِزّ | زاڵکەر |
| ٢٥ـ المُذِلّ | زەبوونکەر |
| ٢٦ـ السَّمِیْع | بیسەر |
| ٢٧ـ البَصِیْر | بینەر |
| ٢٨ـ الحَکَمْ | فەرمانڕەوا ، حوکمڕان |
| ٢٩ـ العَدْل | دادگەر |
| ٣٠ـ اللَّطِیْف | چاکەکاری پەنهان ، وردبین |
| ٣١ـ الخَبِیْر | شارەزا ، هەواڵدەر ، چی یەت زان |
| ٣٢ـ الحَلِیْم | هێدی ، ئارام |
| ٣٣ـ العَظِیْم | مەزن |
| ٣٤ـ الغَفُور | لێبوردە ، گوناح پۆش |
| ٣٥ـ الشَّکُور | ستایشکەر ، سوپاسگوزار |
| ٣٦ـ العَلِیّ | بەرز |
| ٣٧ـ الکَبِیْر | گەورە |
| ٣٨ـ الحَفِیْظ | پارێزەر |
| ٣٩ـ المُقِیْت | بژیوگەێن ، دەستەڵاتدار |
| ٤٠ـ الحَسِیْب | لێپرسەرەوە |
| ٤١ـ الجَلِیْل | سیفەت بەرز |
| ٤٢ـ الکَرِیْم | بەڕێز ، ڕێزگر |
| ٤٣ـ الرَّقِیْب | چاودێر |
| ٤٤ـ المُجِیْب | وەڵامگۆ |
| ٤٥ـ الواسِع | فراوان |
| ٤٦ـ الحَکِیْم | کاربەجێ ، لیزان |

| | |
|---|---|
| ٤٧ـ الوَدُود | بەندەدۆست ، خۆشویستراو |
| ٤٨ـ المَجِيْد | پایەبەرز ، خاوەن شکۆ |
| ٤٩ـ الباعِث | زیندووکەرەوە ، نێرەر |
| ٥٠ـ الشَّهِيْد | ئاگادار ، ئامادە |
| ٥١ـ الحَقّ | پایەدار ، ڕاست ، هەق |
| ٥٢ـ الوَكِيْل | کارپێ سپێرراو ، پشت وپەنا |
| ٥٣ـ القَوِيّ | بەتوانا |
| ٥٤ـ المَتِيْن | بەهێز ، قایم |
| ٥٥ـ الوَلِيّ | دۆست ، یاریدەدەر |
| ٥٦ـ الحَمِيْد | سوپاسکراو ، شایستەی سوپاس |
| ٥٧ـ المُحْصِي | ژمێرەر |
| ٥٨ـ المُبْدِئ | پەیداکەر |
| ٥٩ـ المُعِيْد | گێڕەرەوە ، زیندووکەرەوە |
| ٦٠ـ المُحْيِي | ژێنەر |
| ٦١ـ المُمِيْت | مرێنەر |
| ٦٢ـ الحَيّ | زیندوو |
| ٦٣ـ القَيُّوم | مشوورگێڕ ، ڕاوەستاو |
| ٦٤ـ الواجِد | هەبوو |
| ٦٥ـ الماجِد | خاوەن پایەی بەرز |
| ٦٦ـ الواحِد | یەک |
| ٦٧ـ الأحَد | تاک ، تەنیا |
| ٦٨ـ الصَّمَد | حەوجێ پێ بوو ، جێی مەبەست |
| ٦٩ـ القادِر | توانادار |

| | |
|---|---|
| ٧٠ـ المُقْتَدِر | خاوەن سەرچاوەی توانا |
| ٧١ـ المُقَدِّم | پێشخەر |
| ٧٢ـ المُؤَخِّر | دواخەر |
| ٧٣ـ الأَوَّل | یەکەمین |
| ٧٤ـ الآخِر | دوامین |
| ٧٥ـ الظّاهِر | دیار ، ئاشکرا |
| ٧٦ـ الباطِن | ون ، پەنهان |
| ٧٧ـ الوالِي | سەرپەرشتیکەر |
| ٧٨ـ المُتَعال | زۆر بەرز ، خۆ بەبەرزگر |
| ٧٩ـ البَرّ | چاکەکار |
| ٨٠ـ التَّوّاب | تۆبە وەرگر |
| ٨١ـ المُنْتَقِم | تۆڵەستێن |
| ٨٢ـ العَفُوّ | چاوپۆشی کەر |
| ٨٣ـ الرَّؤُوف | میهرەبان |
| ٨٤ـ مالِكُ المُلْك | خاوەن مڵک |
| ٨٥ـ ذو الجَلال والاكرام | خاوەن پایەی بەرزو ڕێز |
| ٨٦ـ المُقْسِط | دادپەروەر |
| ٨٧ـ الجامِع | کۆکەرەوە |
| ٨٨ـ الغَنيّ | دەوڵەمەند |
| ٨٩ـ المُغْني | دەوڵەمەندکەر ، بێ نیازکەر |
| ٩٠ـ المانِع | بەرگر ، پێشگیری کەر |
| ٩١ـ الضّارّ | زیان گەێن |

| | |
|---|---|
| ٩٢- النّافِع | سوودگەیێن |
| ٩٣- النّور | رووناکی |
| ٩٤- الهادِي | ڕێ پیشاندەر |
| ٩٥- البَدیع | داهێنەر ، بێ وێنە |
| ٩٦- الباقِي | هەرماو |
| ٩٧- الوارِث | میراتگر |
| ٩٨- الرَّشید | کارزان ، شارەزاکەر |
| ٩٩- الصَّبور | ئارامگر ) . |

## چەند ئاگاداری یەک دەربارەی ناوەکانی خوا

١- وەک لەو فەرموودانەوە کە رابردن دەردەکەوێ ناوی (اللّه) جل جلالە لە ریزی (٩٩) ناوەکان نەژمێرراوە ، دەنا دەیکردە (١٠٠) ، بێگومان هەر واشە چونکە فەرموودەکە دەڵێ ( إنّ للّهِ .. ) کەواتە ئەو (٩٩) ناوە هەموویان سیفەتی ( اللّه ) ن و وەسفی ئەویان پێ کراوە .

٢- مەبەست لە رستەی ( مَنْ أحصاها دَخَلَ الجَنّةَ ) لەسەر رای زۆربەی زانایان لەبەرکردن و تێگەیشتن و بیرلێ کردنەوەی ئەو ناوە بەرزو پەسندانەیە .

٣- کاریگەری ی ئەو ناوە بەرزو چاکانە بۆ چاککردنی ئینسان و لەخوا نیزیک خستنەوەی دا ، لەو ڕووەوەیەکە خوای بەرزو مەزن پێی خۆشە بە ناوو سیفەتە بەرزەکانی مەدحی بکەین ، وە هەتا زیاتریش ئەو ناوو سیفەتە بەرزو چاکانەی خوا لەدڵ و مێشکی ئینسان دا جێگیر ببن و ، پتر

...............................................

بیریان لێ بکاتەوە ، زیاتر کاردەکەنە سەر دەرو دەروونیو لە سیفەتی بەرزو رەوشتی پەسند نیزیکتر دەبێتەوەو لە ناسینی خوادا شارەزاتر دەبێو قاڵتر دەبێتەوە .(١)

٤- هەندێک لە ناوە پەسندو چاکەکانی خودا ( صیغة المبالغة ) یان بۆ بەکارهێنراوە وەک : الفتاح ، التواب الوهاب .. الخ . بەڵام :
لەبەرئەوەی لەکوردی دا ئەم جۆرە دەربڕین ( تعبیر ) ە نیە ، من هەروا بە ئاسایی وەرم گێڕاونە سەر زمانی کوردی .
دەنا لەراستیدا ئەگەر مانای وشەییم رەچاوکردبا دەبوو بۆ ( الفتاح ) گوتبام : زۆر زۆر زۆر ............ دەرووکەرەوە !!
وە هەروەها بۆ ئەوانی دیکەش .

...............................................

(١) لە هەرکام لە ( الأذکار ) ی ( نووي ) و ( تحفة الذاکرین ) ی ( شوکاني ) دا ناوە بەرزەکان نەقلّ کراون بڕوانە ( الأذکار ) ص ٩٤ .
وە ( تحفة الذاکرین ) ص ٥٣ . ە
ئەوەندە هەیە لە کتێبی ( الأذکار ) دا ناوی ( الأحد ) کە ژمارەکەی (٦٧) ە ، پەڕێنراوەو ، جگە لە ناوی ( الله ) ژمارەی ناوەکان (٩٨) ە ، بەڵام :
( تحفة الذاکرین ) بەو شێوەیەی هێناون کە من نووسیومن .



## - ٥ -

# خودا هەمووشتێکی لەسەر بنچینەی زانیاری یەکی قووڵ و بێ سنوور خوڵقاندوە

مرۆڤی مسوڵمان بڕوای وایە کە خودا هەرچی دروستی کردوە هەمووی لەسەر بنچینەی زانیاری یەکی قووڵ و بێ سنوور دروستکردوەو لە هیچ کام لە دروستکراوانی خوادا هێندەی نووکی دەرزی یەش ناڕێکیو بێ یاسایی نابینرێ . (١)

---

(١) ( ماتَرىٰ في خَلْقِ الرَّحْمٰنِ مِنْ تفاوُت فَاْرْجِعِ البَصَرَ هَلْ تَرىٰ مِنْ فُطورٍ ثمَّ ارْجِعِ البَصَرَ كَرَتيْنِ يَنْقَلِبْ إِلَيْكَ البَصَرُ خاسِئاً وَهوَ حَسِيْرٌ ) الملك / ٣ ، ٤ .

لە دروستکراوی خوادا نالێکی نابینی ، چاوبگێڕە بزانە هیچ کەلێن و کونان دەبینی ؟ دووبارە جار لەدوای جار چاوبگێڕە بەڵام لەئەنجامدا چاوت بە دەرکراوی و ماندوویی دەگەڕێتەوە لات .

خوێنەری خۆشەویست !

ئەم دەقەی سەرێ ئەنجامگیری ( إستنتاج ) یێکی یەکجار گرنگ و بایەخ داری لێ وەدی دێ :

ئەویش ئەوەیە کە بەپێچەوانەی وڕێنەو قسەی بزرکێنراوی کەسانێکەوە کە خۆ بە بێ بڕوا و [دژخوا] !! پێشان دەدەن ، گەشەکردن و بەرەوپێش چوونی زانیاری و پەردەلاچوون لەسەر ڕازو نهێنییەکانی بوونەوەرو ، دۆزرانەوەی یاساو دەستوورەکانی سروشت نەک هەر نابێتە هۆی بەرەوپاش چوونەوەی بیری ئایینی ( الفكر الديني ) و بەرەو بێبڕوایی چوونی خەڵک ! بەڵکو بەبەراوەژووەوە هەتا پتر زانیاری بەرەوپێش بچێ و زیاتر ڕازو نهێنییەکانی بوونەوەر ئاشکرا بن و ، یاساو دەستوورەکانی سروشت چاکتر پەیان پێ ببرێ و



بدۆزرێنەوە ، بیری ئایینی - بەڵام ئایینی راست و نەشێوێنراو کە بەس ئیسلامە - بەگشتیو بڕوابەخوا بوون و خواناسی بەتایبەتی زیاتر گەشە دەکاو فراژوو دەبێ و چاکتر رەگان دادەکوتێ لە دڵ و دەروون و بیرو هۆشی خەڵکیدا .

دەزانی بۆ ؟!

چونکە بوونەوەر کتێبی بینراو ( كتاب منظور ) ی خودایەو ، جێگەی تێدا دەرکەوتنی سیفەتە بەرزو پەسندەکانی - یەتی لە ویستو توانا و زانیاری و بەزەیی و .. هتد وە ئاوێنەی تێدا درەوشانەوەی ناوەکانی یەتی .

ئنجا گومانی تێدا نیە مرۆڤ هەتا پتر بە کتێبی نووسەرێک ئاشنا بێ ، زیاتر بە کەسایەتی ئەو نووسەرەو سیفەتەکانی ئاشنا دەبێ و چاکتری دەناسێ .

بۆ وێنە ئێمە هەتا زیاتر کتێبی ( إحياء علوم الدين)ی ئیمامی غەززالیو ( مجموع الفتاوی ) ی ئیبنو تەیمییەو ( رسائل النور ) ی سەعیدی نورسیو ( في ظلال القرآن ) ی سەیید قوطبو ( تفهيم القرآن ) ی مەودوودی موتالا بکەینو بخوێنینەوەو بتوێژینەوە ، پتر پەی بە پایەبەرزیو شارەزایی ئەو ناودارانە دەبەین و چاکتر دەیان ناسین ، خوا لە هەموویان خۆش بێ و پلەیان بەرزتر بکاتەوە .

ئنجا لەراستیدا راست بەپێچەوانەی ورێنەی بێبڕوایانەوە ، هەتا زیاتر زانیاری گەشە بکات و بوونەوەر چاکتر یاساو دەستوورەکانی ئاشکرا بن ، بیری بێ بڕواییو کافرایەتی زیاتر پاشەکشە دەکاو بەپاشەوە دەچێتەوە !!

دەزانی بۆ ؟!

چونکە بیری بێ بڕوایی بە هەموو جۆرو شێوەکانی یەوە سەرجەم دەچێتەوە سەر یەک ئەسڵ ، ئەویش ئەوەیە کە بوونەوەرو هەرچی تێیدایە ، لەخۆوەو بێ هیچ کردگارو پەروەردگارو مشوورخۆرێک دروستبووەو بەرێوەدەچێ !!

بەواتایەکی دی هەموو جۆرو شێوەکانی بیری بێ بڕوایی سەرجەم لەو بنچینەیەدا هاوبەشن و لەسەر ئەو ئەسڵە رێک کەوتوون ، کە دروستبوون و بەرێوەچوونی بوونەوەر سەرچاوەیەکی عاقڵانەو حەکیمانەی نیە !

بەکوردی بوونەوەر بە رێکەوتو هەرەمەکی و گۆترەکاری

دروست بووەو ، هیچ کەس نەخشەو بەرنامەیەکی زانیاریانەی وردو قووڵی بۆ دانەناوەو ، وەک ( تاویری سەرەوژێر ) کەوتۆتەرێ و ، کەسیش نازانێ بۆکوێ دەچێو پاشەڕۆژو سەرەنجامی چۆن دەبێ !!

بەلام بەرەوپێش چوونی زانیاری ( سەرلەبەری لقەکانی ، بەلام بەتایبەتی زانیاری یە سروشتی یەکان ) و دۆزرانەوەی یاساو دەستوورەکانیو پەردەلاچوون لەسەر رازو نهێنی یە سەرسامکەرەکانیو ، پەی بردن بە ڕێک وپێکیو یاسادارییەکەی بە ئاشکراو بێ چەندو چوون ڕای دەگەیەنێ :

کە بابە ئاگاداربن بوونەوەر ( تاویری سەرەوژێر ) و گورزی ( شەلم کوێرم کەس نابوێرم ) نیەو لەسەر بنچینەی زانیاری و لێزانییەکی وردو قووڵ و حسێب کراو ڕۆنراوەو بەگوێرەی نەخشەو بەرنامەیەکی زانایانە بەڕێوەدەچێ !!

کەواتە ئەو ئەسڵ و بنچینەیەی کە بێ بڕوایان بە بەلگەیان لەقەلەم دابوو و کردبوویان بە بناغەی بیری قرپۆکیان و ، کۆشکی ئەفسانەیی خوانەناسیان لەسەر هەلچنی بوو ، نە بەردو نە کەستەک و نە قوڕو ... بەلکو بەلمیش تەواو دەرنەچوو !!

جا گومانیشی تێدا نیە کە دیواری بێ بناغە ڕاناوەستێو ، دەستبەجێ بەلاچوون و نەمانی بناغە دیواریش لەسەرڕا بۆخوارێ هەرەس دێنێو هیچی بەسەر هیچەوە نامێنێ !

هەربۆیەش خوای بێ وێنە فەرموویەتی: ( سَنُرِيهِمْ آياتِنا في الآفاقِ وفي أنفسِهِمْ حتَّى يَتَبَيَّنَ لهُمْ أنهُ الحَقُّ .. ) فصلت/٥٣.
واتە: لەمەودوا بەلگەو نیشانەکانی خۆمانیان پێشان دەدەین لە ئاسۆیەکان ـ ئاسمانەکان ـ داو لە نەفسی خۆیان دا ، هەتا بۆیان ڕوون بێتەوە کە ئەو ـ خودا ـ هەقەو ڕاستە .

بێگومان ئەم ئایەتە گفت و بەلێن و مزگێنییەکی خۆشی تێدایە ، کە ئێستا سوپاس بۆخوا بەچاوی خۆمان دەیبینین ؛ چۆن زانیاری یە سروشتییەکان بوو ونە خزمەتکارو پەردەستی بێ فیزی بیری ئایینیو ، چاکترین و بەهێزترین پالپشتی بیری خواناسیو ، درەوشاوەترین و بێ پێچ و پەناترین بەلگەی دەستی بڕواداران .

## -٦-

# خوا بەرنامەو پەیرەوێکی ناردوە تاقە بەرنامەی ڕاست و تێرو تەواوە

مرۆڤی مسولمان بڕوای وایە کە خوای بێ وێنە هەروەک چۆن نە لە زاتی دا، نە لە سیفەتەکانی دا، نە لە دروستکراوانی دا، نە لە قسەو وتارەکانیدا، کەموکووڕی و ناتەواوی و هەڵەو پەڵەی نیەو لە هەموو لایەنێکەوە پاک و بەرزو پەسندەو هاوتای نیە، ئەو بەرنامەو پەیڕەوەش کە تەواوکەری بەرنامەی گشت پێغەمبەرانەو (١)علیهم السلام بە دوایین پێغەمبەری خۆی ( محمد )دا علیه الصلاة والسلام ناردوویەتی (٢) تێروتەواوو پاک و بێگەردەو (٣) وەڵامگۆی هەموو پرسیارەکانی ژیانی مرۆڤەو (٤) شیفاو چارەسەری

---

(١) ( وأنزلنا إليكَ الكِتابَ بالحقِّ مُصَدِّقاً لِما بَيْنَ يَدَيْهِ مِنَ الكتابِ ومُهَيْمِناً عَلَيْهِ ..) المائدة/٤٨ . وە قورئانمان بۆلای تۆ ناردوە ڕاستیی تێدایە ، کتێبەکانی پێش خۆی بەڕاست دەزانێو پەسەریانەوە چاودێرە ..

(٢) ( ماكانَ مُحَمَّدٌ أبا أحَدٍ مِنْ رِجالِكُمْ ولٰكِنْ رَسُولَ اللّٰهِ وخاتَمَ النبيِّينَ ) الأحزاب / ٤٠ . موحەممەد باوکی هیچ کام لە پیاوانتان نیە ( مەبەست لە زەیدە ) بەڵکو نێرراوی خواو کۆتایی پێغەمبەرانە علیهم الصلاة والسلام .

(٣) ( اليَوْمَ أكْمَلْتُ لَكُمْ دِينَكُمْ ..) المائدة /٣ . ئەمرۆ بەرنامەکەتانم بۆ تەواو کردن .

(٤) ( ونَزَّلْنا عَلَيْكَ الكتابَ تِبْياناً لِكُلِّ شَيْءٍ وهُدىً ورَحْمَةً وبُشْرىٰ للمسلمين ) النحل / ٨٩ . وە قورئانمان ناردۆتەسەر تۆ، هەموو شتێک ڕوون دەکاتەوە ، وە ڕێ ڕوونیو خێرو خۆشیو موژدەیە بۆ مسولمانان .

سەرلەبەری گیروگرفت و دەردو نەخۆشی یەکانی یەتی و[1] تاقە بەرنامەیەکە ، کە بتوانێ سەربەرزی و بەختیاری ڕاستەقینە بۆ تاک و کۆمەڵ بێنێتەدی و[2] دادگەری و یەکسانی و ئازادی لەنێو کۆمەڵدا بچەسپێنێ ،[3] وە تاقە بەرنامەو ڕێبازێکە کە ئینسان بتوانێ بەهەشتی بەرین و ڕەزامەندی خودای پێ وەدەست بێنێ .[4]

---

(١) ( قُلْ هُوَ لِلَّذِيْنَ آمَنُوا هُدىً وشِفاءٌ .. ) فصلت / ٤٤ . بلێ: ئەوە ڕێنمایی و چارەسەرە بۆ ئەوانەی بڕوادارن .
( ونُنَزِّلُ مِنَ القُرْآنِ ما هُوَ شفاءٌ وَرَحْمَةٌ لِلْمُؤْمِنِيْنَ) الأسراء / ٨٢ . وە ئەوەی لە قورئانێ دەینێرینەخوارێ چارەسەرو ڕەحمەتە بۆ بڕواداران .

(٢) ( وَلِلّهِ العِزَّةُ ولِرَسُولِهِ ولِلْمُؤْمِنِيْنَ .. ) المنافقون / ٨ . وە سەربەرزی بۆ خواو بۆ پێغەمبەرەکەی و بۆ بڕوادارانە ..
( مَنْ عَمِلَ صالحاً مِنْ ذكر أوْ أنثى وَهُوَ مُؤْمن فَلَنُحيِيَنَّهُ حياةً طَيِّبَةً ) النحل / ٩٧ . هەرکەسێک کردەوەی چاک بکات لە نێر یان لە مێ وە بڕواداریش بێ ئەوە لە ژیانێکی خۆش و پڕ ئارامی دا دەی ژیەنین .

(٣) ( إنَّ اللهَ يَأمُرُ بالعَدْلِ وَالأحْسانِ وإيتاءِ ذِيْ القُرْبى .. ) النحل / ٩٠ . خودا فەرمان دەکات بە دادگەری و چاکە کردن و دەستگیرۆیی کردنی خزمان ..
( فلذلك فادْعُ واستقِمْ كما أُمِرْتَ ولاتَتَّبِعْ أهْوائَهُمْ وقُلْ آمَنْتُ بِما أنزلَ اللهُ مِنْ كتابٍ وأُمِرْتُ لِأعْدِلَ بَيْنَكُمْ ) الشورى / ١٥ . جا بانگەوازی بکە بۆ ئەوەی کە گوترا ، وە وەکو فەرمانت پێ کراوە خۆت ڕاگرە ، وە مەکەوە دوای ئارەزووەکانیان ، وە بلێ بڕوام بە هەر کتێبێک هێناوە کە خوا ناردوویەتی ، وە فەرمانم پێ کراوە کە بە دادگەری حوکمتان لەنێوان دا بکەم .

(٤) ( إن هذا القرآن يَهْدي لِلَّتي هِيَ أقْوَمُ ويُبَشِّرُ المُؤْمنينَ الذين يَعْمَلُونَ الصّالحاتِ أنَّ لهم أجْراً كبيراً ) الأسراء / ٩ . بەڕاستی ئەم قورئانە ڕێنمایی ـ مرۆڤ ـ دەکات بۆ تەواوترین ژیان ، وە مۆژدەی پاداشتێکی گەورە دەدات بەو بڕوادارانەی کە کردەوەی چاک دەکەن .

## ٧ـ
# خوا هەموو کردەوەکانی ڕاستو بەجێو حیکمەت دارن

مرۆڤی مسوڵمان بڕوای وایە کە هەرچی خودا بیکات و ئەنجامی بدات بێ سوودو حیکمەت نیەو، مەرجیش نیە مرۆڤ پەی بە ڕازو نهێنیو حیکمەتی هەموو کردارێکی خوا بەرێ، کەواتە: خوای بەخشندەو تۆڵەستێن هەروەک چۆن زاتی و سیفەتیو قسەی و بەرنامەی و دروستکراوی و ناوی، لەوپەڕی تێروتەواوی دان و لە هەموو کەموکووڕی یەک بەدوورن، کرداریشی دیسان بەپێی حیکمەتو زانیاری یەکی بێ وێنەیەو هەموو کردەوەیەکی بەجێیەو پڕ لە سوودو خێرو بەرژەوەندی یە.(١)

---

(١) ﴿وَعَسَىٰ أَنْ تَكْرَهُوا شَيْئاً وَهُوَ خَيْرٌ لَّكُمْ وعَسَىٰ أَنْ تُحِبُّوا شَيْئاً وَهُوَ شَرٌّ لَكُمْ﴾ البقرة / ٢١٦.
وە ڕەنگە شتێکتان بدزێ و ئەو شتە بۆتان چاک بێ، وە ڕەنگە شتێکتان خۆش بوێ و ئەو شتە بۆتان خراپ بێ.

# لاپەڕێک دەربارەی دەلالی پرسیارێکی خوتخوتەکەر

خوێنەری خۆشەویست!
لێرەدا دەمەوێ وەڵامێکی ورد بخەمەروو بۆ پرسیارێک کە ڕەنگە خوتخوتەی زۆر دڵان بدات: باشە مادام کردەوەکانی خوا هەموویان لەسەر بنچینەی زانیاری و لێزانی یەکی

بێ سنوورو حیکمەتێکی باڵا بەڕێوەدەچن ، وە لەڕاستیشدا هەرچی لە بوونەوەردا ڕوودەدات لەو لایەنەوە کە بەپێی زانیاری و نەخشەو ئەندازەگیری خوداو بەهۆی ویست و دەستەلاتی وی یەوە پەیدا دەبێ دروستکراوی وی یە ، بۆچی نارەزایی بەرانبەر بە هەڵوێست و ڕەفتاری ستەمکارانەی زۆردارو طاغووتە خۆبەخوازانەکان دەربڕین و لێیان ڕاپەڕین و ئەو بارو دۆخو واقیعە نائیسلامی یانەی کە هێناویانەدی بیان گۆڕین ؟!

بەواتایەکی تر بڵێین :

مادام ئەو ڕووداوو کارەساتانە بە ویست و دەستەلاتی خواو بەگوێرەی نەخشەو بەرنامەی خوا دێنەدی و هەر کارو کردارێکیش خوا پێی هەستێ و ئەنجامی بدات ڕاست و بەجێ و حیکمەتدار بێ ، چۆن بەخۆمان ڕەوا ببینین دژی واقیعێک بجەنگین کە ویست و دەستەلاتی خوای کاربەجێ و لێزان هێناویەتەدی ؟!

لەوەڵامدا دەڵێین :

هەرچەندە جێی تەرخانی ئەم جۆرە باسانە ئاڵقەی چوارەمی ئەم زنجیرەیەیە بەناوی ( قەزاوقەدەر ) ، بەڵام لێرەش کورتە وەڵامێکی هەر دەدەینەوە :

ڕاستە ئەم واقیعەو هەر واقیعو کارو کارەسات و ڕووداوێکی چاک یان خراپ هەر بە ویستی خوداو بەگوێرەی نەخشەو بەرنامەیەک کە خودا دایناوە دێنەدی ، بەڵام هەر ئەو خودایەی کە ئەو یاسا سروشتی یانە ( القوانین التکوینیة ) ی داناون کە بەپێی وان هەموو شتێک ـ چاک و خراپ ـ دێتەدی ، هەمان خوداش چەند یاسایەکی شەرعی ( القوانین التشریعیة ) ی داناون ، کە فەرمانمان پێ دەکەن ڕاپەڕین و هەر واقیعێک و هەر دیاردەیەک کە لەگەڵ بەرنامەو شەرعی خوادا نەگونجا لای بەرین .

ئنجا دەبێ بزانین کە ویست و ڕەزامەندی ( الإرادة والرضى ) ی خودا مەرج نییە هەموو دەمێ پێکەوە گونجاو و پەیوەست بن ، بەڵکو جاری وایە لێک دەترازێن و دژی یەکدی دەوەستن ، بۆ وێنە خودا لە قورئانیدا دەفەرموێ : ( مەی مەخۆنەوە ) ، بەڵام ویستی وایە کە شەرابخۆرەکان بیخۆنەوە ، لێرەدا ویست و ڕەزامەندی خوا لێک جودان .

کەواتە : مەرج نیە هەر واقیعێک کە بە ویستی خوا دروست بوو ، بەپێی ڕەزامەندی خوداش بێ ، بەڵکو دەبێ بۆئەوەی داخوا فلان واقیع یان فلان کردەوە خوا پێی ڕازی یە یان نا ، لە بەرنامەکەی دا بۆی بگەڕێین ، چونکە بەرنامەو ئاینی خوا هەموو دەمێ لەگەڵ ڕەزامەندی ی دا پێکەوە جووتن و لێک ناترازێن .

کەواتە پوختەی قسان :

لەبەر ئەوەی خودا بەدیهێنەرو پەروەردگاری هەموو شتێکە ، ناگونجێ هیچ شتێک بەبێ ویست و توانای وی دروست بێ ، کەواتە هەرچی پەیدادەبێ چاک و خراپ هەر بەپێی ویستی خوداو بەهۆی توانای وی یەوەیە ، بەلام مەرج نیە هەرچی بەپێی ویستی خودا ـ ویستی خوداش لەو یاساو دەستوورانەدا بەڕێوەدەچێ کە لە بوونەوەرو ژیانی ئینساندا لەکاردان ـ پەیدابوو ، خودا لێی ڕازی بێ تاکو ئێمەش ناچاربین ملی بۆ کەچ بکەین و پێی ڕازی بین .

ئنجا ئەوەی خودا لەسەر ئێمەی پێویستکردوە ئەوەیە کە بەپێی ئەو یاساو دەستوورە ئاینی و شەرعی یانە بەڕێوە بچین ، کە خودا ناردوونیو لەگەڵ ڕەزامەندی و پەسندی خۆی دا لێکی بەستوون ( وَرَضِيتُ لكمُ الأَسْلامَ دِيْناً ) المائدة/٣ چونکە ئێمە دەبێ بەدوای ڕەزامەندی خوادا وێڵ و عەودالَ بین ، ڕەزامەندی خوداش لە شوێن کەوتنی ئەو بەرنامەیەدایە کە لێی ڕازی یەو پەسندی کردوە .

دەنا ئەگەر بمانەوێ وەدوای ویستی خوا بکەوین ، ئەوە پێویست بە ویستن و نەویستنی ئێمە ناکات ، چونکە هەرچی بکەین هەر بەویستی خودا دەیکەین و ناتوانین لەژێر ڕکێفی ویست و دەسەلاتی وی دەربچین ( وما تشاؤن إلا أن يشاء الله .. ) التكوير / ٢٩ . بەلام دەتوانین لە بەرنامەو ڕەزامەندی خودا دەربچین و لارێ بین .

کەواتە :

ئێمە بۆیە رادەپەرین بۆ گۆڕین و لابردنی ئەو واقیعانەی دژی بەرنامەی خودان ؛ چونکە خودا فەرمانی پێ کردووین و بەوە لێمان ڕازی دەبێ ، ئنجا خوداش هەرچەندە ئەو واقیعانەی بەویستی خۆی هێناونەدی ، بەلام لەرێ ی کردەوەو ویست و هەلبژاردنی خراپ و لەگەڵ شەرع و ڕەزامەندی خوادا

..............................................

نەگونجاوی خراپەکارانەوە هاتوونەدی ، وە دەیەوێ بۆی بگۆڕین بە جۆرە واقیعێک کە لەگەڵ ئابین و ڕەزامەندیی دا بگونجێن .

بەپێویستی دەزانم بۆ پتر ڕوون بوونەوەی مەبەست پێشەکی وێنەیەک بێنینەوە - لە ژیانی ڕۆژانەمان دا - بۆ چۆنیەتی لێک جوێ بوونی ( ویست و ڕەزامەندی ) و دوایش وێنەیەک دێنینەوە بۆ پتر ئاشکرا بوونی چەمک و مەبەستی ویستی خودا ( إرادة الله ) :

وێنەی یەکەم :
بۆ ڕوونکردنەوەی لێک جیایی ویست و ڕەزامەندی:

باب‌ێک دوو کوڕی هەن ، پێیان دەڵێ : ڕۆڵەکانم ئەوە باڵغ بوون و لەمڕۆ بەدواوە پیاون و تەکلیفی شەرعتان لەسەرە ، جا داواتان لێ دەکەم مسوڵمانی چاک بن و بێ فەرمانی خوا و پێغەمبەر علیه الصلاة والسلام مەکەن ، هەرکامێکتان پیاوی چاک بێ و بێ فەرمانی خوا نەکات ، با لە ماڵێ من دا بمێنێتەوەو لەسەر چاومی دادەنێم ، بەڵام هەرکامێکتان بێ فەرمانیو سەرەخەری بکات و ڕێ ی خوارو خێچو هەڵەت و هەڵدێر بگرێ ، لە کوڕی خۆمی دەشۆرێنم و لە ماڵێ خۆم وەدەرێ ی دەنێم ، ئەوە پێم گوتن ، پاشان نەڵێن ئاگادار نەبووین و نەمانزانی !!

پاشان دوای ماوەیەک یەکیان ڕێ ی چاکەو خواپەرستی گرت و یەکیشیان سواری کەرێ شەیتانی بوو و نەهاتە ژێربار ، جا هەرچەندە بابەکە چەند جارێکی دیکەش ئامۆژگاری کردو ئاگاداری کردەوەو ترساندی ، بەڵام فایدێ ی نەبوو !! تا لەئاکامدا بابەکە کوڕە بەدفەڕەکەی لە ماڵێ وەدەرناو خوێری کردو بڕۆ بەخێرهاتێ !!

جا با سەرنج بدەین !

بێگومان هەم مانەوەی کوڕە گوێ ڕایەڵ و مسوڵمانەکەو هەم دەرکران و خوێری کرانی کوڕە بەدفەڕو لاسارەکەش هەردووکیان بە ویستی بابەکە هاتنەدی ، بەڵام دیارە کە بابەکە هەرچەندە لە مانەوەی کوڕە چاکەکەدا ڕەزامەندی هەبوو، بەڵام لە دەرکرانی کوڕە بەدکارەکەدا ڕەزامەندی

نەبوو ، واتە مانەوەی کورە چاکەکەی پێ خوش بوو ، بەڵام خوێری کرانی کورە بەدەکەی پێ خۆش نەبوو ، کەواتە :
ڕاستە جاری وایە ئینسان شتێک دەکات و ویستی لەسەر پەیدابوونی شتێکە ، بەڵام پێی خۆش نیەو لێی ڕازی نیە .

ئێستاش پێم وایە تا ئەندازەیەکی چاک چۆنیەتی لێک جوێبوونی ویست و ڕەزامەندی خودا ڕوون بۆوە ، ئنجا با بچینە سەر وێنەی دووەم :

وێنەی دووەم :
بۆ ڕوونکردنەوەی چەمک و واتای ویستی خودا :

دەتوانین ویست ( إرادة ) ی خودا سبحانە وتعالی وە ئاوی کانی‌یەک بچوێنین ، کە ئاوێکی سپی و ساف و بێ ڕەنگ و بێ تام و بۆنە ، دوو کەس دەچنە سەر ئەو کانی‌یەو ، یەکێکیان هەندێک ئاوی لێ هەڵدێنجێ و دەیکاتە نێو سوراحی‌یەکەوەو ئەندازەیەک شەکرو شەربەت و لیموندزی لەگەڵ تێکەڵ دەکات و شەربەتێکی شیرین و بەتام و چێژی لێ دروست دەکات ، ئەوی دیکەشیان هەر لە هەمان کانی هەندێک ئاو هەڵدێنجێو لە گۆزەیەکی دەکاو پاشان مستێک خۆڵی تێ دەکات و ئاوی نێو گۆزەکە دەکاتە ئاوێکی قوراوو پیس و نابەرچاو .
بێگومان هەم شەربەتە شیرین و جوان و بۆن خۆشەکەو هەم ئاوە قوراوو لیتڵ و تام و بۆن ناخۆشەکەش ، هەردووکیان لە ئاوی کانی یە سپی‌و ساف و ڕوونەکە هەڵهێنجرابوون ، بەڵام ئی یەکەمیان بەهۆی دەستکارێ و بەکارهێنانی چاکەوە شەربەتی لە ئاوی کانی‌یەکە ڕەخساندو ، ئی دووەمیشیان بەهۆی دەست تێ وەردان و خراپ بەکارهێنانەوە قوراوی لێ فەراهەم هێنا ، کەواتە ئاوی کانی یەکە لە ئەسڵ دا سپی‌و ساف و بێ ڕەنگ و بێ تام‌و بۆن بوو ، بەڵام بە ویست و هەڵبژاردن و کردەوەی دوو کەسەکە بەشێکی شەربەتی لێ دروست بوو و تام‌و بۆن و ڕەنگێکی چاکی گرت ، وە بەشێکیشی قوراوی لێ دروست بوو و تام‌و بۆن و ڕەنگێکی بەدو خراپی پێوەنووسا .
دەجا ئیرادەی خوداش بەهەمان شێوە :

خودا ویستی خۆی کردۆته یاریدەدەری هەموو کەس ، ئنجا ئایا ئەو کەسانە بە ویست و هەڵبژاردنی خۆیان تام و بۆن و رەنگی چاک لەگەڵ ویستی خوا لێک دەدەن و کارو رەفتارو واقیعی چاک و مسولمانانە دەرەخسێنن ، یان بەپێچەوانەوە تام و بۆن و رەنگی بەدی لەگەڵ لێک دەدەن و کردارو ئاکارو بارودۆخی خراپ و نامسولمانانە پەیدا دەکەن ، ئەوە عایدی خۆیانەو دەکەوێتە ئەستۆی خۆیان .

ئنجا لەبەرئەوەی خودا کوفرو خراپەی بەدڵ نیەو لێی رازی نیە ، لەسۆنگەی ئەوەوە کە بە ویست و هەڵبژاردنی تاوانباران و تام و رەنگ و بۆنی خراپ و بەدی تاوانان هاتوتەدی وەک فەرموویەتی :( .. إِنَّ اللَّهَ لَا يَرْضَىٰ لِعِبَادِهِ الْكُفْرَ .. ) الزمر / ٧ . واتە :
.. بێگومان خوا کوفری پێ پەسند نیە – و پێی رازی نیە – بۆ بەندەکانی .
لەسۆنگەی ئەوەوە ، خوا فەرمانمان پێ دەکات کە ئەو واقیع و بارودۆخ و ئاکارو کردارە دزێو و خراپانە بگۆڕین و هەوڵ دەین بە ویست و هەڵبژاردنێکی لەگەڵ بەرنامەو رەزامەندی خودادا گونجاو ، واقیع و بارودۆخ و ئاکارو رەفتارێک بێنینە کایەوە کە خودا پێی رازی بێ و تام و بۆن و رەنگێک لە ئاوی ساف و بێگەردی کانیاوی ویستی خودادا بێنینەدی ، کە لەگەڵ بەرنامەو یاسا شەرعیە پەسندەکانی خوادا بگونجێن بۆئەوەی هەم ویست و رەزامەندی خوداو هەم ویستی ئێمەو رەزامەندی خودا پێکەوە گونجاو بن و دژو پێچەوانەی یەکدی نەبن ، وەک خودا فەرموویەتی :
( وَإِنْ تَشْكُرُوا يَرْضَهُ لَكُمْ .. ) الزمر / ٧ . واتە :
وە ئەگەر سوپاسی خوا بکەن – و بەندەی چاک و بەئەمەگ بن – خوا بۆتان پەسند دەکاو لێتان رازی دەبێ ..
هەڵبەتە رەزامەندی خوداش گەورەترین مەبەستی مرۆڤی خواناس و بەرزترین لووتکەی ئاوات و ئامانجیەتی وەک خودا فەرموویەتی :
( .. وَرِضْوَانٌ مِنَ اللَّهِ أَكْبَرُ ذَٰلِكَ هُوَ الْفَوْزُ الْعَظِيمُ ) التوبة / ٧٢ . واتە :
وە رەزامەندی یەک لەلایەن خواوە گەورەترە – لە هەموو شتێک – هەر ئەوەش بردنەوەی گەورەیە .

# - ٨ -

# خوا دادگەرەو هەموو کەس بەیەک چاو سەیردەکاو پلەو ئیمتیازی نەداوەتە کەس

مرۆڤی مسوڵمان بڕوای وایە کە خودا بەیەک چاو سەیری مرۆڤەکان دەکاو (١) هیچ پلەوپایەو ئیمتیازێکی نەداوەتە هیچ ئینسان و هیچ نەتەوەو ڕەگەزو چین و توێژو خێڵ و تیرەو بنەماڵەیەک بەسەر باقی خەڵکی دا، (٢) وەکو جوولەکەکان دەیانگوت و دەیڵێن و باقی ڕەگەزو نەتەوەو تیرەو وەجاخو چین پەرستەکان دەیڵێن، تاقە سەنگی مەحەک و پێوەرو تەرازووی خەڵک پێوان و هەڵسەنگاندنیش لەلای خوا بریتیە لە مسوڵمانەتی و تەقواو پارێز، (٣) وە هیچ کام لە پارەو سامان و دەسەڵات و ڕەنگ و زمان و ڕەگەزو وەجاخ ناگونجێ بکرێنە پێوەرو تەرازووی گەورەو بچووکی و گرانیو سووکی مرۆڤەکان.

---

(١) ( يا أَيُّها النَّاسُ ) الحج / ١ . ئەی خەڵکینە !
( يا بَنِي آدَمَ ) يس / ٦٠ . ئەی وەچەی ئادەم !
( يا أَيُّها الأنسانُ ) الأنفطار / ئەی ئینسان !

(٢) ( يا أَيُّها النَّاسُ إِنَّا خَلَقْناكُمْ مِنْ ذَكَرٍ وَأُنْثى ... ) الحجرات / ١٣ . ئەی خەڵکینە ئێوەمان لە نێر ( ئادەم ) و مێ ( حەووا ) یەک دروستکردوە ...

(٣) ( إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِنْدَ اللَّهِ أَتْقاكُمْ ) الحجرات / ١٣ .

بەڕاستی بەڕێزترتان لەلای خوا – واتە لە تەرازووی بەرنامەکەیدا – پارێزکارترتانە .

( إنَّ اللَّهَ تعالىٰ أذْهَبَ عَنْكُمْ عُبِّيَةَ الجاهليَّة وفَخْرَبتَها بالآباءِ إنَّما هُوَ مُؤْمِنٌ تَقيٌ وفاجِرٌ شَقيٌّ ، النَّاسُ بَنُوا آدَمَ وآدَمُ خُلِقَ مِنْ تُرَابٍ ) رواه أبوداوود والترمذي . . واتە :

خوای بەرز فیزو دەماری نەفامی و خۆهەڵدانەوە بە باب و باپیرانی لە ئێوەدا لابردوە ، بەس دوو کەس هەن ، بڕواداریکی پارێزکار ، بەدکاریکی تاوانبار ، خەڵک وەچەی ئادەمن و ئادەمیش لە گڵ دروست بووە

( النَّاسُ مُسْتَوُون كأَسْنانِ المَشْطِ لَيْسَ لأَحَدٍ فَضْلٌ علىٰ أَحَدٍ إلاَّ بتَقْوىٰ اللهِ ) أخرجه الديلمي عن أنس .

واتە :

خەڵک وەک دەنکەکانی شانە یەکسانن ، کەس لە کەس گەورەتر نیە مەگەر بە – زیاتر – پارێزکردن لەخوا .

-٩-

# خوا ڕێزی لە مرۆڤ گرتوە و خۆشی دەوێ و بە جێ نشینی خۆی بەهەندی کردوە

مرۆڤی مسوڵمان بڕوای وایە کە خودا جَلَّ جَلالُه ئینسانی کردوە بە جێگری خۆی لەسەر زەوی و (١) ڕێزی لێ گرتوەو خۆشی دەوێ. (٢) نەک وەک جوو و دیانەکان دەڵێن، کە پێیان وایە خوا دانووی لەگەڵ ئینسان دا ناکوڵێ و ڕقی لێیەتی و دوژمنایەتی کۆنیان پێکەوە هەیەو، هەر مرۆڤێک کە لەدایک دەبێ بە تاوانباری و شەرمەزاری لەدایک دەبێ و ئەو تاوانەی کە کاتی خۆی (ئادەم) کردی بەڵایەکە لە ئەستۆی هەموو مرۆڤێک دایەو (٣) لەسێدارەدرانی عیساش علیه السلام بۆ سڕینەوەی ئەو تاوانە بووە! (٤)

---

(١) ( هُوَ الَّذِي جَعَلَكُمْ خَلائِفَ فِي الأَرْضِ ) فاطر / ٣٩.
ئەو ـ خوا ـ ی لەسەر زەوی گێڕاونی بە جێ نشین.

(٢) ( وَلَقَدْ كَرَّمْنا بَنِي آدَمَ ) الأسراء / ٧٠. وە ڕێزمان لە وەچەی ئادەم گرتوە.
( وهُوَ الغَفورُ الوَدود ) البروج / ١٤. وە ئەو لێبوردەیەو بەندەکانی خۆی خۆش دەوێ.

(٣) هەرکەسێک سەرنجێکی سەرپێیی لە تەورات و ئینجیل بدات شایەدی ڕاستیی ئەم قسانە دەبینێ. ( بێگومان تەورات و ئینجیلی دەستکاری کراو گۆڕدراو ).

(٤) دیانەکان بڕوایان وایە کە عیسی علیه السلام کاتی خۆی

وه نەک وەک ئەفسانەکانی یۆنانی و ئیغریقی گومـان دەبەن گوایە خوا زۆر لە خوای ئاگر ( زیوس ) تووڕە بووە چونکە ئاگری لە خوا دزیوەو داویەتە دەست ئینسان .(١)

---

.....................................

بەدەستی جوولەکەکان گیراوەو لە قەنارە دراوە ، هەڵبەتە قورئان ئەم قسەیەی وەدرۆ خستۆتەوەو فەرموویەتی :
( وَمَا قَتَلُوهُ وَمَا صَلَبُوهُ وَلَكِن شُبِّهَ لَهُم ) النساء / ١٥٧ .
واتە :
وە – جووەکان – عیسایان نەکوشتوەو لەداریان نەداوە ، بەڵکو وێنەی ویان لێ براوەتە سەر یەکێکی دیکە .
جا دیانەکان دەڵێن خوا بۆیە کوڕی خۆی بە لەداردان دا تا ببێتە قۆچی قوربانی بۆ مرۆڤایەتی و ئەو تاوانـەی ئادەم کردی بیسڕێتەوە !!

(١) لەڕاستیدا یەکێک لە هۆیە بنەڕەتییەکانی بـەرەو بێ بڕوایی و بێ دینی چوونی وڵاتە ئەوروپاییەکـان ، ئەوەبوو کە کتێبە ئاینییەکانی وەک ( تەورات ، ئینجیل زەبوور ) بەهۆی گۆڕان و دەستکاری کرانەوە ، تیروانین و بیروبۆچوونی سەیرو سەمەرەو ناماقوولیان تێدابـوون دەربارەی خودا ، بۆ وێنە تەوراتی ئێستا لە بەشی دووەمی ( سیفر تکوین ) دا ئاوا باسی هۆو چۆنیەتی دەرکرانی ئادەم لە بەهەشتی دەکات :
( ئنجا خودا لە گڵی زەوی ئادەمی دروستکردو بای ژیانی بە مێشکیدا کردو ئادەم گیانی هاتەبەر . وە خودا هەمـوو جۆرە درەختێکی جوان و بەتامی لەزەوی دا ڕواند، وە درەختی " ژیان " ی لە نێوەڕاستی باغداو درەختی " زانینـی چاک و خراپ " یش .... وە خودا فەرمانی بە ئادەم کـرد کە بۆت هەیە لە تێکرای درەختانی باغ بخۆی ، بەڵام لـە درەختی " زانینی چاک و خراپ " مەخۆ ، چونکە لـەو ڕۆژەی دا کە لێی دەخۆی شایستەی مردنێ دەبی ..... ! ) .
وە لە بەشی سێیەمی ( سیفر تکوین ) دا گوتراوە :
( وە دەنگی خودایان بیست کە لەدەمی بەرەبەیان دا لەنێو

باغیدا گۆرانی دەگوت ! وە ئادەمو هاوسەرەکەی لەنێو درەختانی باغەکەدا خۆیان لەخوا شاردەوە ! وە خودا بانگی ئادەمی کردو پێی گوت لەکوێ ی ؟ ئەویش وەڵامی دایەوە کە لەنێو باغیدا دەنگی تۆم بیست و ترسام ، چونکە ڕووتم لەبەر ئەوە خۆم حەشاردا .

وە خودا پێی گوت : کێ بەتۆی گوتوە کە ڕووتی ؟ ئایا لەو درەختەی کە پێم گوتی لێی مەخۆ خواردت ؟ وە ئادەم گوتی ئەو ژنەی کە دابووت بە من ، ئەو لەو درەختەی دامێو خواردم !

وە خودا گوتی ئێستا کە ئادەم بەهۆی " زانینی چاک و خراپ " ەوە وەک یەکێک لە ئێمەی لێ هاتوە ، جا نەوەک دەستی خۆی درێژ بکات و لە " درەختی ژیان " یش بچنێ و بخوات و بۆ هەمیشە بژیەت ! ئنجا لەپاشان خودا ئەوی لە باغی " عدن " دەرکرد بۆئەوەی لەو زەوی یەدا کە ئەوی لێ دروستکردوە جوتیاری بکات .... ! ) .

جا ئێستا با سەرنج لەم داستانە ئەفسانەیی یەی تەوراتی دەستکاری کراو ( مُحَرَّف ) بدەین ، داخوا چەند تێڕوانینی هەڵەو خوارو خێچی دەربارەی خودا تێدان :

١- درۆ پاڵدانە لای خوا ، چونکە خودا بە ئادەمی گوت ئەگەر لە فلان درەخت بخۆی دەمری ، کەچی لێشی خواردو نەشمرد !!

٢- ڕژدی پاڵدانە لای خوا ، چونکە خودا حەزی نەکرد ئادەم و حەووا لە درەختی زانیاری و ژیان بخۆن ، نەوەک زانا ببن و ژیانی هەمیشەیی وەدەست بێنن !!

٣- حەسوودی پاڵدانە لای خوا ، وەک دەبینین خودا بەهۆی زانیاربوونی ئادەمەوە حەسوودی پێ بردوەو لە بەهەشتی دەری کردوە !!

٤- جەستە پاڵدانە لای خوا ، وەک دەڵێ : لەدەمی بەرەبەیاندا گۆرانی دەگوت !!

٥- بێ ئاگایی و نەزانی پاڵدانە لای خوا ، چونکە دەڵێ : بانگی ئادەمی کرد کە لەکوێ ی ؟!

کەواتە دەبێ چ گلەیی یەک لە بابایەکی زاناو ژیر بکرێ کە لە ئایینێکی ئاوا بڕەوێتەوەو ملی بیابانی بێ دینی بگرێ ؟!

ئنجا با سەرنجی قورئانی بەهێزو پێز بدەین داخـــوا پەیوەندی نێوان خوداو ئادەم چۆن باس دەکات !!

( وإذْ قالَ ربُّكَ لِلْمَلائِكَةِ إنّي جاعِلٌ في الأرْضِ خَليْفَــةً قالُوا أتَجْعَلُ فِيْها مَنْ يُفْسِدُ فيْها ويَسْفِكُ الدِّماء ونَحْنُ نُسَبِّحُ بِحَمْدِكَ ونُقَدِّسُ لَكَ قالَ إنّي أعْلَمُ مالاتَعْلَمونَ . وعَلَّــمَ آدَمَ الأسْماءَ كُلَّها ثُمَّ عَرَضَهُمْ عَلى المَلائِكَةِ فَقالَ أنْبِئُونِيْ بِأسْمـاءِ هٰؤُلاءِ إنْ كُنْتُمْ صادِقِيْنَ قالُوا سُبْحانَكَ لا عِلْمَ لَنا إلّا مـا عَلَّمْتَنا إنَّكَ أنْتَ العَليْمُ الحَكِيْمُ قالَ يا آدَمُ أنْبِئْهُــمْ بأسْمائِهِمْ فَلَمّا أنْبَئَهُمْ بِأسْمائِهِمْ قالَ ألَمْ أقُلْ لَكُمْ إنّــي أعْلَمُ غَيْبَ السَّمٰواتِ والأرْضِ وأعْلَمُ ماتُبْدُونَ وما كُنْتُــمْ تَكتُمُوْنَ ؟ وإذْ قُلْنا لِلْمَلائِكَةِ اسْجُدُوا لِآدَمَ فَسَجَدُوا ... )

البقرة / ٣١ — ٣٤ . واتە :

كاتێک پەروەردگارت بە فریشتانی فەرموو : مـــــن جێگرێک لەزەوی دا دادەنێم ، گوتیان : ئایا کەسێکی تێدا — بە جێگر — دەگێری کە خراپەی تێدا دەکاو خوێنێ دەڕێژێ، لەحاڵێک دا کە ئێمە لەگەڵ سوپاس کردنت دا بەپاکت دەگرینو بێ پەلەییت ڕادەگەیەنین ؟ فەرمووی : ئەوەی من دەیزانم ئێوە نایزانن . وە هەموو ناوەکانی فێری ئادەم کــرد ، دوایی ناوبراوەکانی لەسەر فریشتان ڕانواندن ، فەرمووی : ناوی ئەوانەم پێ بڵێن ئەگەر ڕاستگۆن . گوتیان : تـــۆ پاکی ، ئێمە هیچ زانیاری یەکمان نی یە مەگەر ئەوەی تـۆ فێرمان بکەی ، بێگومان تۆ زانای کاربەجێی . فەرمووی : هۆ ئادەم ناوەکانیان پێ بڵێ ، جا کاتێک ناوەکانیانی پێ گوتن ، فەرمووی : ئەدی پێم نەگوتن من نهێنـــــی ئاسمانەکان و زەوی دەزانمو ئەوەی دەری دەبرن و پەنهانـی دەکەن دەیزانم ! وە کاتێک بەفریشتانمان گوت : کڕنـووش — ی ڕێزگرتن — بەرن بۆ ئادەم ، دەستبەجێ کڕنووشیـــان برد ...

وەک دەبینین :

..............................................

١- خودا ، ئادەم بە جێ نشینی خۆی لەقەڵەم دەدات ، دیارە جێگریش دەبێ خاوەنی ئەوپەڕی ڕێزو خۆشەویستیو متمانەو باوەڕی ( جێ دار ) ەکەی بێ ، دەنا لەجێی خۆی داینانێ .

٢- خودا زانیاربوونی ئادەم دەکاتە بەڵگەی شایستەبوونی ئادەم بۆ جێگرایەتی .

٣- دوای خستنەڕووی زانیاری و شارەزایی ئادەم،فەرمانی بە فریشتان کردوە کە کڕنووش - ی ڕێزگرتن - ی بۆ بەرن .

کەواتە لەڕوانگەی قورئانەوە زانایی ئادەم نەک هەر هۆی بوغزێنران و لە بەهەشت دەرکرانی نەبووە لەلایەن خوداوە ، بەڵکو ڕاست بەبەراوەژووەوە تاقە هۆی ڕێز لێ گیران و بە کەڵکی جێگرایەتی هاتنی ئادەم ئەوەیە کە زانیاری یەکی هەبووە فریشتان شکیان نەبردوە .

تێبینی :
وەک دیتمان لە تەوراتی ( گۆڕراو ) دا تاوانی قەدەغەشکاندن و لە درەخت خواردن خراوەتە ئەستۆی ( حەووا ) وە ، بەڵام قورئان بەئاشکرا خستوویەتە ئەستۆی هەردووکیان ( ئادەمو حەووا ) وە ، وەک دەفەرموێ :

( فَأَكَلا مِنْها فَبَدَتْ لَهُما سَوْءاتُهُما .. ) طه / ١٢١ .

کەواتە :
ئەوەی کە لەنێو مسوڵمانان دا بۆتە باو کە گوایە شەیتان پێشێ حەووای فریوداو ئەویش ئادەم ، یەکێکە لە ئەفسانەو ئیسرائیلی یاتەکان و فری بەسەر ئیسلام و قورئانەوە نیە .

- ١٠ -

# خوا هیچ دەڵاڵ و واسطەیەکی لە نێوان خۆی و بەندەکانی دا دانەناوە

مرۆڤی مسوڵمان بڕوای وایە کە مرۆڤ بۆ ئەوەی گفتوگۆو ڕازو نیازی بەندایەتی لەگەڵ خوادا بکات و لێی وەپاڕێ و بیپەرستێو داوای لێ بکات، حەوجێی بە هیچ جۆرە دەڵاڵ و واسطەیەک نیە کە لەنێوان خواو مرۆڤدا هەبێ، بە پێچەوانەی ئەفسانەکانی کلێسایی‌و بیری پووچی بت پەرستی بەهەموو شێوەکانی‌یەوە، کە پێیان وایە مرۆڤ ڕێ ی ناکەوێ یەکسەر بچێتە خزمەت خوداو، دەبێ هۆو وەسیلەیەک لەنێوان دا هەبێ کە ببێتە ئامرازی پەیوەندی نێوان خواو بەندە، (١) بەڵکو مرۆڤی مسوڵمان بڕوای وایە کە دەتوانێ یەکسەر لەهەر کات و شوێنێک دا حەزبکات بەبێ پەردە لەگەڵ خوادا بدوێو بیپەرستێو لەبەری وەپاڕێو داوای لێ بکات (٢)!

---

(١) ( وَالَّذِينَ اتَّخَذُوا مِنْ دُونِهِ أَوْلِيَاءَ مَا نَعْبُدُهُمْ إِلَّا لِيُقَرِّبُونَا إِلَى اللَّهِ زُلْفَى ) الزمر / ٣ . وە ئەوانەی کە بێجگە لەخوا چەند شتێکی دیکەیان کردۆتە خوای خۆیان ـ دەڵێن ـ لەبەر ئەوە دەیانپەرستین تاکو لە خوامان نیزیک بخەنەوە .

(٢) ( وَإِذَا سَأَلَكَ عِبَادِي عَنِّي فَإِنِّي قَرِيبٌ أُجِيبُ دَعْوَةَ الدَّاعِ إِذَا دَعَانِ .. ) البقرة / ١٨٦ .
وە ئەگەر بەندەکانم دەربارەی من پرسیاریان لێ کردی ئەوە من نیزیکم ، وەڵامی داوای دووعاکەر دەدەمەوە هەرکاتێک بانگم بکات .

- ١١ -

# خوا خاوەنی ڕۆژی سزاو پاداشتەو بەبێ ڕێدانی وی تکاو ڕەجا بۆکەس نیە

مرۆڤی مسوڵمان بڕوای وایە کە خودا خاوەن و گەورەو فەرمانڕەوای ڕۆژی سزاو پاداشتەو (١) ئەگەر لەدنیادا خودا گەورەیی‌و سەروەری ی خۆی خستۆتە ژێر پەردەی نەدیترانەوە، لەو ڕۆژەی دا بێ پەردە دەردەکەوێ، (٢) وە لەو ڕۆژەی دا هیچ کەس ناتوانێ تکاو ڕەجا بۆ هیچ کەس بکات هەرچەندە یەکجار بەڕێزو پایەبەرزبێ، مەگەر خوا فەرمان بکاو ڕەزامەندی لەسەربێ، (٣) ئنجا خودای دادگەریش ڕای گەیاندوە

---

(١) ( مالِكِ يَوْمِ الدِّيْنِ ) الفاتحة / ٤ .
خاوەنی ڕۆژی سزاو پاداشتە .

(٢) ( لِمَنِ المُلْكُ اليَوْمَ ؟ لِلّهِ الوَاحِدِ القَهّار .. ) المؤمن /١٦.
ئەمڕۆ دەستەڵات ئی کێ یە ؟ ئی خوای تاکی زاڵ و گەردن کەچکەرە .

(٣) ( مَنْ ذا الّذي يَشفَعُ عِنْدَهُ إلا بِأذْنِهِ .. ) البقرة / ٢٥٥ .
کێیە ئەوکەسەی تکا لەلای وی - خوا - بکات، مەگەر بە فەرمانی وی ؟!
( يَوْمَ يَقُوْمُ الرّوحُ والمَلائِكَةُ صَفّاً لا يَتَكَلَّمُوْنَ إلّا مَنْ أذِنَ لَهُ الرَّحمٰن وقالَ صَواباً ) النبأ / ٣٨ .
ئەو ڕۆژەی کە جوبرائیل و فریشتەکان ڕادەوەستن، قسە ناکەن مەگەر ئەوەیان کە خوای میهرەبان ڕێ ی بداتو قسەی پەسندیش بکات .

که ڕێ نادات تکا ( شفاعة ) بۆ کەس بکرێ مەگەر بەندەیەکی فەرمانبەرو چاکەکار بووبێ و جێی ڕەزامەندی خوا بووبێ [(١)]
کەواتە ئەوانەی گوێ نادەنە جێبەجێ کردنی فەرمانەکانی خواو پێغەمبەرو علیه الصلاة والسلام بەتەما تکاو ڕەجای پێغەمبەر علیه الصلاة والسلام یان فلان و فیسار شێخ پشتێندیان لێ کردۆتەوەو دەستیان لێ وەبن سەری داوە، با سوور بزانن خراپ حاڵی بوون و پیس بەسەهوو چوون [(٢)].

---

(١) ( وَلاَیَشْفَعُونَ إِلاَّ لِمَنِ ارْتَضَىٰ .. ) الأنبیاء / ٢٨ .
وە ـ فریشتەکان ـ بۆ کەس تکاو ڕەجا ناکەن مەگەر بۆ کەسێک کە خودا لێی ڕازی بێ .

(٢) ( الكَیِّسُ مَنْ دَانَ نَفْسَهُ وَعَمِلَ لِمَا بَعْدَ المَوْتِ والعاجِزُ مَنْ أَتْبَعَ نَفْسَهُ هواها وتَمَنَّىٰ عَلَىٰ اللَّهِ ) رواه الترمذي .
واتە :
ژیرو وریا ئەو کەسەیە کە لێپرسینەوە لەگەڵ نەفسی خۆی دا بکات ، وە بۆ پاش مردنێ کار بکات ، وە بەستەزمان کەسێکە کە نەفسی وەدوای ئارەزووەکانی دەخات و وە خۆزگەی بێ جێ ـ لەخوا دەخوازێ .

# ئەنجام و بەرھەمی ئەم جۆرە بڕواو خواناسینە

هەروەک چۆن هاتنەدەرەوەی تیشک و ڕووناکی لە دەرگاو پەنجەرەکانی ژوورێکەوە کە چرایەکی تێدا هەڵکراوەو، میوە دەرکردنی درەختێکی بەردار کە لە زەوی یەکی بەپیت دا نێژراوە ، ئەنجامێکی ئاسایی و بەرهەمێکی سروشتی و چاوەڕوان کراوە ، بەهەمان شێوەش پەیدابوونی کردەوەو ڕەفتاری چاک و پەسندو جموجۆڵ و چالاکی مسوڵمانانە لەکەسێک دا کە بڕواو خواناسینی لەدڵ دا دامەزراوە ئەنجام و بەرهەمێکی سروشتی و چاوەڕێ کراوە . هەربۆیەش دەبینین وشەی ( الْعَمَلُ الصَّالِح ) کردەوەی چاک دەیان جار لەگەڵ وشەی ( إیمان ) لە قورئانیدا دووبارە بۆتەوە .

جا بێگومان بڕوابەخوا بوون لە سەرلەبەری ژیانی تاکی و کۆمەڵی ئینسان دا پەرێزو شوێنەواری هەیە ، بەڵام ئەوەی ئێمە لێرەدا دەمانەوێ لێی بکۆڵینەوە ، بریتیە لە پەرێزو شوێنەواری بڕوابەخوا بوون و خواناسی بەس لەلایەنی پەیوەندی نێوان خوداو ئینسانەوە ، واتە ئایا مرۆڤێک بەوجۆرەی کە لە (١١) خاڵی ڕابردوودا باسمان کرد بڕوای بە خودا هەبێ و خوا بناسێ،هەڵوێستی سەبارەت بەخوا چ دەبێ و پەیوەندی لەگەڵ خوادا چۆن دەبێ ؟!

جا ئێمە ئەوە لە (٥) خاڵان دا ئەو مەسەلەیە دەخەینەڕوو :

١- یەکلابوونەوە بۆخوا لە پەرستن دا :

* * * * *

بەڵێ یەکەمین ئەنجام و بەرهەمی بڕوابەخوا بوون و خواناسینی تێروتەواو ئەوەیە کە ئینسان لە بەندایەتی و گەردن کەچی و پەرستن ( عبادة ) دا بۆخوا یەکلا دەبێتەوەو بەخۆی ڕەوا نابینێ بێجگە لەوی بەندەی کەسی دیکە بێت و ڕووی دڵی لە قیبلەیەکی دیکە بێت ، چونکە ( معبود ) و ( معشوق ) بە ئەندازەی تێروتەواوی ( کمال ) یان پەرسترا ( معبودیة ) و خۆشویستران ( محبوبیة ) یان لە دڵی پەرستار ( عابد ) و ئەویندار ( عاشق ) دا پەیدادەبێ و سەقامگیر دەبێ ، جا بێگومان خوداش سبحانه وتعالی ( وَلَهُ المَثَلُ الأَعلَىٰ ) لەوپەڕی سیفەت بەرزی و ئاکارپەسندی دایەو ، مادام واش بێ جێی خۆیەتی هەرکەسێک خۆی بە بەندەو پەرستاری وی زانی ، خۆی بۆ یەکلاو ساغ بکاتەوەو بەشی کەسی دیکە بەخۆیەوە نەهێڵێ ، وەک خوای بێ هاوتا فەرموویەتی : ( فَٱعْبُدِ ٱللَّهَ مُخْلِصاً لَّهُ ٱلدِّينَ .. ) الزمر / ٢.
واتە : جا خوا بپەرستەو گەردن کەچیتی بۆ ساغبکەوە ..

هەڵبەتە چەمکی ( عبادة ) یش بەس لە جوغزی نوێژو ڕۆژوو و ذیکرو پاڕانەوەدا کورت هەڵنایەت و یەکجار بەرین و فراوانە ، وەک خودا لە سوورەتی ( یوسف )دا فەرموویەتی : ( إِنِ الحُكْمُ إِلاَّ لِلَّهِ أَمَرَ أَلاَّ تَعْبُدُوا إِلاَّ إِيَّاهُ ذَٰلِكَ الدِّينُ القَيِّمُ ) یوسف / ٤٠ .

واتە : فەرمانڕەوایەتی بەس ئی خودایە ، فەرمانی کردوە کە جگە لەوی کەس نەپەرستن ، ئەوەیە ئایینی ڕاست و تەواو .

وەک دەبینین پاش باسکردنی فەرمانڕەوایەتی ( حاکمیة ) و کورتهەڵێنانی لەخوادا ، باسی پەرستنی خوا دێنێتەپێش . کەواتە مەسەلەی حوکمو فەرمانرەوایەتیش هەر بەشێکە لە پەرستن ( عبادة ) ی خودا .

بەڵێ جا یەکەمین بەرهەمو ئەنجامی خواناسینی تەواو بریتیە لە یەکلابوونەوەو ساغبوونەوەی مرۆڤ لە گەردن کەچیو بەندایەتیو فەرمانبەری دا بۆخوا ، لە هەموو لایەنەکانی ژیانی تاکیو کۆمەڵی دا ، ئنجا کە وای کرد ئەوە ئەو ئامانجو مەبەستەی هێناوەتەدی کە خودا مرۆڤی بۆ خوڵقاندوە ، وەک دەفەرموێ :

( وَماخَلَقْتُ الجِنَّ وَالاُنْسَ إِلاّ لِيَعْبُدُوْنِ ) الذاريات / ٥٦ .

واتە : جندو مرۆڤم دروست نەکردوە مەگەر بۆ پەرستنی خۆم .

هەڵبەتە بەس دوای ئەو جۆرە بەندایەتیو فەرمانبەرییە هەمەلایەنەیەی گوتیشمان ئەو قسەیەی بابای نوێژکەر وەڕاست دەگەڕێ کە دەڵێ ( إِيّاكَ نَعْبُدُ ) بەس تۆ دەپەرستین .

٢- پاڕانەوەو داواکردن بەس لەخوا :

* * * * *

دووەمین ئەنجام و بەرهەمی بڕوابەخوا بوون و خواناسینی تەواوو ساغ ، بریتیە لەوەی کە مرۆڤ بێجگە لە خوای میهرەبان و وەڵامگۆ دەستی پاڕانەوەو کڕووزانەوە بۆلای کەس بەرزنەکاتەوەو بۆ ئەو شتانەی کە بێجگە لەخوا لەدەستی کەس نایەن ، جگە لەخوا داوا لەکەس نەکات و ڕووی نیازو مەبەستی بەس لەخوا بێ و لە بەدەنگەوەهاتن و وەڵامدانەوەشی پشت ئەستوورو دڵنیابێ ، خوداش فەرموویەتی :

( .. فَلاتَدْعوا مَعَ اللّٰهِ أَحَداً .. ) الجن / ١٨ .

واتە : .. جا وێڕای خوا لەکەس مەپاڕێنەوە ..

پێغەمبەریش علیه الصلاة والسلام فەرموویەتی :

( مَنْ أَحَبَّ أَنْ يَكُوْنَ أَقْوىٰ النّاسِ فَلْيَتَوَكَّلْ عَلىٰ اللّٰهِ .. )

رواه إبن أبي حاتم . واتە :

کێ حەزدەکات بەهێزترین کەس بێ با پشت بەخوا ببەستێ ..

هەڵبەتە کەسێکیش بەڕاستی خوای ناسیبێ و بزانێ کە مردن و ژیان و قازانج و زیان و خۆشی و ناخۆشی و ساغی و نەساغی و دەوڵەمەندی و هەژاری و .. هتد ، لەبەردەستی خوادایەو هیچ شتێک بێ ویستی وی پەیدانابێ و گۆڕانی بەسەردا نایەت ، بەخۆی ڕەوانابینێ بێجگە لەخوا لەبەر کەس بلاڵێتەوەو لەدەرگای کەس بدات و داوای هیچ شتێک لەهیچ کەس بکات .

ئنجا هەرکاتێکیش مرۆڤ ئاوا بوو ئەوکاتە دەتوانێ بڵێ لە گوتنی ( وَإِيَّاكَ نَسْتَعِيْن ) دا ڕاستم کردووەو بەس یارمەتی و کۆمەکیم لەخوا خواستوە .

٣- لەهەموو شتێک پتر خۆشویستنی خوا :

* * * * * *

بەڵێ یەکی دیکە لە ئەنجام و بەرهەمە مسۆگەرو سروشتییەکانی خواناسین و بڕوابەخوا بوونی تەواو ، ئەوەیە کە مرۆڤ لەئەنجامی ئاشنابوونی بە سیفەت بەرزی و ئاکار پەسندی و بێ هاوتایی و تەواوی ی خودادا لەهەموو کەس و هەموو شتێکی خۆشتر بوێ ، چونکە بەدەردی ئیمامی غەززالی دەڵێ : دوو شت دەبنە هۆی خۆشویسترانی هەرکەسێک :

یەکەم : ئەوە کە ئەو ئینسانە لە زاتی خۆی دا تێروتەواو بووبێ، یان لە سیفەتێکی بەرزو پەسنددا زۆر تەواو بووبێ، وەک : جوانی ، ئازایەتی ، بەخشندەیی ، زانیاری ، بێئەوەی تۆ لەوکەسەوە بەهرەو سوودێکت پێ گەیبێ ، بۆ وێنە هەموو کەس یوسفی لەبەر جوانیی و داوێن پاکیی و ئیمامی عەلی لەبەر ئازایەتیی و حاتەمی لەبەر بەخشندەیی خۆش دەوێ ، بێ ئەوەی لەوانەوە قازانجێکی ماددی پێ بڕابێ .

دووەم : ئەوەیە کە ئەو ئینسانە خێروچاکەو بەرژەوەندییەکی لێ هەڵوەری بێ و قازانجێکی بۆتۆ هەبووبێ ، جا بێگومان خوای بێ وێنە هەم بۆخۆی لەزاتی خۆی دا خاوەنی هەموو سیفەتێکی بەرزو پەسندو چاکە ، وە هەم هەرچی چاکەو خێرو خۆشی و نازو نیعمەت هەیە لەویەوە بە ئێمەو غەیری ئێمەش دەگات ، بەکوردی خودا هەم تەواو ( کامِلْ ) ە و هەم تەواوکەر ( مُكَمِّلْ ) ە .

کەواتە جێی خۆیەتی لەهەموو شتێک و هەموو کەس زیاتر خۆش بویسترێ ، هەربۆیەش خوای خۆشەویست فەرموویەتی : ( وَالَّذِيْنَ آمَنُوا أَشَدُّ حُبًّا لِلَّهِ .. ) البقرة / ١٦٥ . واتە :

وه ئەواتەی بڕوایان هێناوە خوایان خۆشتر دەوێ ..

پێغەمبەریش علیه الصلاة والسلام فەرموویەتی :

( ثَلاثٌ مَنْ كُنَّ فِيهِ وَجَدَ بِهِنَّ حَلاوَةَ الإِيمانِ : أَنْ يَكُونَ اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَحَبَّ إِلَيْهِ مِمَّا سِواهُما .. ) متفق عليه . واتە : سێ خەسڵەت لەهەر کەسێکدا هەبن ئەوە شیرینایەتی بڕوای پێ دەستگیر کردوون . - یەکەم - کە خوداو پێغەمبەرەکەی لە غەیری وان خۆشتر بوێت ..

٤ - لەهەموو شتێک زیاتر ترسان لەخوا :

* * * * * *

یەکی دیکە لە ئەنجام و بەرهەمە سروشتییەکانی بڕوا بەخوا بوون و خواناسین ئەوەیە کە ئینسان لەهەموو شتێک و هەموو کەس پتر لەخوا دەترسێ و سامی لێ دەکات ، هەڵبەتە کەسێک بەڕاستی خوا بناسێ و بزانێ چەند دەستەڵاتدارو بێ باکەو چەند مەزن و بەڕێزەو چەند بەسام و هەیبەتە ، حەتمەن لێی دەترسێ و سامی لێ دەکات ، چونکە دەزانێ کە تاوان هەرچەندە گچکەش بێ بەڵام لەو ڕووەوە کە سەرپێچی ئەو زاتە مەزنەی تێدایە هەر گەورەو بێزەزایە ، جا بێگومان ئەو تاوانە دەبێتە مایەی ترسان و شەرمەزاری بەرانبەر بەخوا ، هەر بۆیەش خودا فەرموویەتی :

( إِنَّما يَخْشَى اللَّهَ مِنْ عِبادِهِ العُلَماءُ .. ) الفاطر / ٢٨ . واتە : بەڕاستی بەس ئەو بەندانە - وەک پێویست - لەخوا دەترسن کە زانان .. ، چونکە مرۆڤ هەتا پتر خوا بناسێ زیاتر هەست بەوە دەکات کە تاوان و سەرپێچی چەند ناقۆڵاو

بۆ ئەدەبی‌یە سەبارەت بەخوا .

بەلام پێویستە ئەوەش بزانین کە مەبەست لە ( لەخوا ترسان ) ئەوە نیە کە خودا وەک شتێکی ترسناک و بێبەزا بێتە بەرچاوی ئینسان ، چونکە خودا خاوەنی ئەوپەڕی بەرزی و پەسندی و چاکی و میهرەبانی و بەخششە ، بەلکو مەبەست لە ( لەخوا ترسان ) ئەوەیە کە لە سزاو جەزرەبەیەک بترسێ ی کە خودا بۆ تاوان و خراپانەی دیاری کردوە کە مرۆڤ دەیانکات ، دەنا خوای میهرەبان و دادگەر زۆر لەوە بەرزترە کە هەر لەخۆڕا و بێ سووچ و تاوان لە مرۆڤ هەلپێچێ و بەرۆکی بگرێ ، بەلام کەسێک کە بێ گوێ یی خوا دەکات و لە فەرمانی لادەدات ، ئەوە وەک کەری دێزە وایە کە دەلێن لە ڕقی خاوەنی خۆی لە شاخی هەلدەدێرێ !!

جا بێگومان کەسێکیش بێ فەرمانی خوا بکات ئەوە بە دەستی خۆی خۆی تووشی چۆرتمێ کردوەو بۆخۆی خۆی بەپەند بردوە ، وەکو خودا فەرموویەتی :( وَما أَصابَكُمْ مِنْ مُصِيبَةٍ فَبِما كَسَبَتْ أَيْدِيكُمْ .. ) الشورى / ٣٠ . واتە :

وە هەر بەلایەکتان تووش بێ ئەوە کردەی دەستی خۆتانە ..

ئنجا لەکۆتایی‌دا دەلێم :

کەسێک وەک لەخوا دەترسێ و شەرمی لێ دەکات هێندە لەهیچ نەترسێ ، لەڕاستی‌دا ئەو کەسە لە دیلی و کۆیلەیی قوتاری دەبێ و کۆت و زنجیری دەست و پێ‌یانی دەپسێنێ و ئازادی ڕاستەقینە وەدەست دێنێ ، وە بابای وا دەبێتە شێری چەنگ بەخوێن و شەرمێ لە شای ناکاو لەهیچ شتێک سل ناکات ، هەربۆیەش خوای زانا ( بەس لەخوا ترسان ) ی کردۆتە مەرج و خەسلەتێکی گرنگ و بنەڕەتی بابای مسولمانی

کاملّ ، وەک دەفەرموێ : ( فَلاتَخافُوهُمْ وَخافُونِ إِنْ كُنْتُمْ مُؤْمِنِينَ ) آل عمران / ١٧٥ . واتە :

جا لەوان مەترسن و لەمن بترسن ئەگەر ئێوە بڕوادارن .

هەروەها لە وەسفی ئەوانەدا کە خواپەرستی ڕەسەنن و ماڵی خوای ئاوەدان دەکەنەوە فەرموویەتی :

( إِنَّما يَعْمُرُ مَساجِدَ اللَّهِ مَنْ آمَنَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ وَأَقامَ الصَّلاةَ وَآتَى الزَّكاةَ وَلَمْ يَخْشَ إِلَّا اللَّهَ .. ) التوبة / ١٨ .

واتە : بەڕاستی بەس ئەوکەسە مزگەوتەکانی خوا ئاوەدان دەکاتەوە کە بڕوای بەخواو بە ڕۆژی دوایی هێناوە ، وە نوێژێ بەرپادەکاو زەکاتێ دەدات ، وە بەس لەخوا دەترسێ..

٥ـ لەهەموو شتێک بەگەورەتردانانی خوا :

* * * * * *

بەڵێ یەکی دیکە لە ئامانجە سروشتیو مسۆگەرەکانی بڕوابەخوا بوونی ڕاست و تەواو ئەوەیە کە مرۆڤی خوناس خوا لەهەموو شتێک و هەموو کەس بەگەورەترو بەرزتر دەگرێ، چونکە بابایەک بزانێ خوا بەدیهێنەرو پەروەردگاری هەموو شتێکەو تاک و تەنیاو بێ وێنەو هاوەڵەو حەوجێی کەس نیەو هەموو شتێک حەوجێی وێ یەو خاوەنی هەموو سیفەتێکی چاک و پەسندەو لەهەموو پەڵەو ناتەواوی یەک دوورەو .... هتد ، دیارە بەخۆی ڕەوانابینێ نەک هەر هیچ شتێک لەخوا بە بەرزتر بگرێ ، بەڵکو نەشی باتە ڕیزی خواو ، هەر لەگەڵ خواش دا بەراوردی پێ نەکات !!

ئنجا گومانیشی تێدا نیە کە مرۆڤی بڕوادار بە بارتەقای

هەستکردنی بە بەرزی و گەورەیی خودا، هەست بە گچکەیی و بەندەیی خۆی دەکات، وە بەپێچەوانەوە مرۆڤ هەتا لەخوا دوورتر بێ و پێی نائاشنا بێ خۆی لەلا زلتر دەبێ، کەواتە: خۆبەکەمگرتن (تَواضُعْ) بەرهەمی خواناسینەو، خۆبەزلگرتن (تَكَبُّرْ) یش قەلەفسەی بڕکە گوژاڵکی خوانەناسینە، هەر بۆیەش پێغەمبەری ڕابەرمان علیه الصلاة والسلام فەرموویەتی: (لايَدْخُلُ الجَنَّةَ مَنْ كانَ في قَلْبِهِ مِثقالَ ذَرَّةٍ مِنْ كِبْرٍ) رواه مسلم. واتە: هەرکەسێک کێشی گەردیلە ـ یان مێروولەی گچکە ـ خۆبەزلگری لەدڵ دا بێ ناچێتە بەهەشتێ.

بەڵێ هەموو دەمێ خوابەگەورەگرتن و خۆلەکن گچکەبوونەوەو بەندایەتی بەرانبەرخوا نواندن، پێکەوە پەیوەستن، هەر بۆیەش دەبینین (نوێژ) کە ئەوپەڕی بەندایەتی و گچکە نواندنی ئینسانی تێدایە سەبارەت بە خودا، دەبینین بە فەرزو سوننەتەوە (٩٤) جاران وشەی (ألله أكبر) ـ خوا گەورەترە ـ لە پێنج فەرزەکان دا دووبارە بۆتەوە !!

خوای بێ هاوتاش لەکۆتایی (آية الكرسي) دا کە گەورەترین ئایەتی قورئانە، پاش وەسفکردنی خۆی بە چەندان سیفەتی بەرزو پەسند، دەفەرموێ:
(وَهُوَ العَلِيُّ العَظِيمُ) واتە: وە ئەو بەرزی مەزنە.
ئنجا لەکۆتاییدا دەڵێم:
مسوڵمانێکیش هێندە خودای لەلا بەرزو مەزن و گەورەو پایەبڵند بێ، قەتقەت بەخۆی ڕەوانابینێ لەسەر وی ڕا خوایەکی دیکە بگرێ، یان شتێک بێنێتە ڕیزی خودا سبحانه وتعالی، بۆیە (محمد إقبال لاهوري) دەفەرموێ:
(کڕنووش بردنێک بۆخوای تاک لە هەزار کڕنووش بردن بۆ

بەندان ڕزگارت دەکات ) .

( وَسَجدةً لِلَّهِ الأَحَدِ تُنْجِيْكَ مِنْ أَلْفِ سَجْدَةٍ لِلعَبِيْدِ ) .

# مەسەلەیەکی گرنگ

## سوێند خواردن (١) بە غەیری خوا

گومانی تێدا نیە کە کەسێک خودا لەهەموو شتێک بە گەورەترو بەرزتر بگرێ ، ڕێ بەخۆی نادات سوێند بە غەیری وی بخوات ، چونکە مرۆڤ بۆیە سوێند دەخوات تاکو قسەکەی بەهێزتر بکات و سوێندەکە بکاتە پشت وپەنای ، جا مروف کە بیەوێ سوێند بخوات گەورەترین و بەرزترین و پیرۆزترین شت لە فەرهەنگی مێشکیدا هەڵدەبژێرێ و سوێندی پێ دەخوات ، کەواتە سوێندخواردن بەغەیری خوا مەعنا و مەبەستێکی زۆر

---

(١) ( إِبْنُ حَجَرِ الهَيْتَمِيْ) لە کتێبی ( الزَّوَاجِر عَنْ إِقْتِرَافِ الكَبَائِرِ) دا سوێندخواردنی بە غەیری خوا لە ڕیزی گوناحە زلەکان ( الكبائر ) دا حسێب کردوە . ئیمامی ( نَوَوِيْ) یش لە ( رِيَاضُ الصَّالِحِيْنَ ) دا ئەم مەسەلەیەی لە باسێکی سەربەخۆدا هێناوە بەناوی :( بَابُ النَّهْيِ عَنِ الحِلْفِ بِمَخْلُوقٍ ) .

ناماقووڵ و دزێو دەگەیەنێ !!

هەربۆیەش پێغەمبەری خۆشەویستمان علیه الصلاة والسلام فەرموویەتی :( إِنَّ اللَّه تَعالَىٰ يَنهاكُمْ أَنْ تَحْلِفُوا بِآبائِكُمْ فَمَنْ كانَ حالِفاً فَلْيَحْلِفْ بِاللَّهِ أَوْ لِيَصْمُتْ .. ) متفق عليه .

واتە : بەڕاستی خوای بەرز لێی قەدەغەکردوون کە سوێند بە باب و باپیرانتان بخۆن ، جا کێ سوێند دەخوات با سوێند بە خودا بخوات ، یان بێ دەنگ بێ .

وە فەرموویەتی :( مَنْ حَلَفَ بِغَيْرِ اللَّهِ فَقَدْ كَفَرَ أَوْ أَشْرَكَ . ) رواه الترمذي . واتە :

هەرکەسێک سوێند بە غەیری خوا بخوات ، ئەوە کافر بووە یان هاوبەشی پەیدا کردوە .

هەڵبەتە مەرج نیە باباى سوێند بە غەیری خوا خۆر هەموو دەمێ بەو سوێندخواردنەی بچێتە ڕیزی کافرو هاوبەش پەرستانەوە ، بەڵکو تەنیا لەکاتێک دا وای لێ دێ کە ئەو شتەی سوێندی پێ دەخوات لەلای وەک خودا یان بەرزتر بێ ، جا فەرمودەکە یان ئەم حاڵەتە تایبەتیە بێ تامەی لەبەرچاوگرتوە ، یان وەک ئیمامی ( نووي ) فەرموویەتی(1) : مەبەست گەورەکردنی تاوانی گۆرینە لەبەرچاوی خەڵکی تاکو لێی وەپرینگێن .

وە دەشتوانین بڵێین :

مەبەست لە ( فَقَدْ كَفَرَ أَوْ أَشْرَكَ ) ئەوەیە کە سوێند خواردن بەغەیری خوا عادەت و خووی کافرو هاوبەش پەرستانە ، کەواتە هەرکەسێک سوێند بەغەیری خوا بخوات ئەوە یەکێک

---

(1) بڕوانە ( ریاض الصالحین ) لاپەرە ( ٤٨٣ ) .

لە خەسڵەتەکانی ئەوانەی تێدا هاتۆتەدی .

هەڵبەتە مەرجیش نیە بە خەسڵەتێکی کافران ئینسان کافر بێ و لە ئیسلام بچێتەدەرێ ، بەڵکو بەس تاوانبارو لارێ یەو هیچی دی .

چونکە هەروەک چۆن بڕوا ( إیمان ) حەفتاو ئەوەندە یان شەست و ئەوەندە بەشەیەو بەرزترین بەشیان گوتنی ( لا إله إلا الله ) یەو گچکەترینیان لادانی ئازارێکە لەسەر ڕێگا ،(۱) کوفریش کە لە ئەسڵی زمان دا واتە ( داپۆشین ) هەر جۆرە سەرپێچیو لاملیەک لە بەرنامەی خوا دەگرێتەوە ، جا چ پەیوەندی بە بنچینەکان ( الأصول)ەوە هەبێ کە ئەودەمی مانای پڕبەپێستی وشەکەو ئەوپەڕی چەمک ( مفهوم ) ەکەی دێتەدی کە کافربوون و وەرگەڕانە ، وە چ پەیوەندی بە لق وپۆپەکان ( الفروع ) ی ئیسلامەوە هەبێ کە ئەودەمی چەمک و واتای جوزئیو گچکەی وشەی ( کفر ) دێتەدی .

هەڵبەتە بەپێی ئەم بنچینە ( القاعدة ) یەش لە تەفسیرکردن و واتا لێدانەوەی زۆر ئایەت و فەرموودان دا سەرکەوتوو دەبین و ڕێمان لێ تێک ناچێت .

جا خوێنەری بەڕێز !

ئەم (۵) خاڵەی ڕابردن ، ئەنجامو بەرهەمی بڕوا بەخوا

---

(۱) ئەو فەرموودەیە بوخاری و موسلیم ڕیوایەتیان کردوەو ئەمەش دەقەکەیەتی :
( الأيمانُ بِضْعٌ وسَبْعون – أَوْ بِضْعٌ وسِتّونَ – شُعْبَةً ، أَفْضَلُها قَوْلُ لا إِلَهَ إِلَّا اللهُ ، وأَدْناها : إِماطَةُ الأَذى عَنِ الطريقِ ، والحَياءُ شُعْبَةٌ مِنَ الأيمانِ ) بڕوانە ( ریاض الصالحین ) لاپەڕە (۹۶) .

بوون و خواناسی بوون ، لەلایەنی ( پەیوەندی ئینسان بەخوداوە ) دا ، هەڵبەتە بڕوابەخوا بوون و خواناسینی تەواو لە هەموو بوارو لایەنەکانی ژیانی تاک و کۆمەڵی مرۆڤدا پەریزو شوینەوارو بەرهەمی گرنگ و بەرچاوی هەیە ، بەلام ئیمە لیرەدا بەس ئەو باسانە دینینەپیش کە پەیوەندی یان بەخواوە هەیە ، بەڵام لەجێی سەربەخۆ تەرخان کراودا پەریزو شوینەوارە جۆراوجۆرەکانی بڕوابەخوا بوون تویژراونەوە .(١)

(١) لە بەشی سێیەمی بەرگی یەکەمی کتیبی ( گەورەترین راستی ) داو بەرگی یەکەمی ( یادی خودا ) دا ئەم باسە تویژراوەتەوە .

خوێنەری سەنگین !

لەڕاستیدا ـ وەک لە ڕێ خوشکردنی ئەم ئاڵقەیەدا گوتمان ـ ئێمە مەبەستمان لە نووسینی هیچ کام لە باسەکانی ئەم زنجیرەیە ئەوە نیە کە بە ھەست وخوڵیو تێروتەسەلی وەدوای لێکۆڵینەوەو توێژینەوەی نێوەڕۆک و مەبەستی ئەو وشەو زاراوانە بکەوین کە دەیانکەین بە سەردێڕو ناوو نیشانی باسەکان ،(1) بەڵکو مەبەستمان بەس ئەوەندەیە کە بەپێی توانا و بۆلوان چەمک و مەبەستی ئەو وشەو زاراوانە ڕوون بکەینەوەو تەمومژێک کە دەورەی داون و لێیان ھاڵاوە بیرەوێنین و بە ئاوی ڕوون و بێگەردی دوو سەرچاوەی زوڵاڵی قورئان و سوننەت بیان شۆین .

جا بۆیە لە تێکڕای ئەو باسانەدا کە ئەم زنجیرەیە پێک دێنن درێژدادڕی و لێکۆڵینەوەی بەرفراوان نایەتە بەرچاوو ، ھەوڵ دراوە ھەر وشەو زاراوەیەک لەو وشەو زاراوە گرنگ و بنەڕەتیانە کە دەکرێنە ناوو نیشانی ئاڵقەکان لە چەند خاڵێکی یەکجار گوشراوو چڕوپڕدا بخرێتەڕوو و پەردە لەسەر حەقیقەت و مەبەستی لابدرێ .

جا ئێمە ھەرکاتێک ھەست بکەین مەسەلەیەکی گرنگ لەو باسانەی کە ئاڵقەکان پێک دێنن وەک پێویست ڕوون نەکراوەتەوەو حەوجێی باس لێوەکران و توێژانەوەیە ، ئەوە لە کۆتایی ھەر ئاڵقەیەک دا لە دووتوێ ی پاشکۆیەک دا ئەو مەسەلەیە دێنینەگۆڕێ و دەیدەینە بەر شۆقی بەھێزو

---

(1) دیسان ئێمە ئەم باسانە بۆ ئینسانی بڕوادارو خوانا س دەنووسین ، بۆیە بەڵگە بۆ سەلماندنی واقیعیەتی ئەو مەسەلانە نایەنینەوە کە لەم زنجیرەیەدا دەیانخەینەڕوو .

پڕپێزی قورئان و سوننەت .
لەم ئالقەی یەکەمەشدا چوار مەسەلەی گرنگ ماون
هەوجێی ڕوونکرانەوەو شیکرانەوەن ، جا خوا پشتیوان بێ
لەم پاشکۆیەدا دەچینە سەروکاریان :

## یەکەم
## بڕوا بە خوا
## بڕوا بوون بە پاشاداری بوونەوەر تێك ناگیرێن

خوێنەری بەڕێز !
ئەگەر لەیادت بێ لە خاڵی پێنجەمی ئەم ئالقەیەدا گوتمان
( مسوڵمان بڕوای وایە کە خودا هەرچی دروستی کردوە ،
هەمووی لەسەر بنچینەی زانیاری یەکی قووڵ و بێ سنوور
دروست‌کردوەو لە هیچ کام لە دروستکراوانی خوادا هێندەی
نووکی دەرزی یەش ناڕێکیو بێ پاسایی نابینرێ ) .
وە لە پەراوێزی هەمان خاڵ دا ئەم دەقە پیرۆزەی
قورئانمان بەئاپەد هێناوەتەوە : ( ماترىٰ فى خَلْقِ الرَّحْمٰنِ
مِنْ تَفَاوتٍ فَارْجِعِ البَصَرَ هَلْ تَرىٰ مِنْ فُطُورٍ ثُمَّ ارْجِعِ البَصَرَ
كَرَّتَيْنِ يَنْقَلِبْ إِلَيْكَ البَصَرُ خاسِئاً وهُوَ حَسِيْرٌ ) الملك / ٣ ، ٤
واتە : لە دروستکراوی خوادا نالێکی نابینی چاوبگێڕە
بزانە هیچ کەلێن و کونان دەبینی ! دووبارە جار لەدوای
جار چاوبگێڕە ، بەڵام لەئەنجامدا چاوت بە دەرکراوی و
ماندووەتی دەگەڕێتەوە لات .

بێگومان ئەگەر هیچ ئەنجامگیری ( إستنتاج ) یێکی ژیرانە لەو قسانەی کە ڕابردن دەستگیربێ ئەوەیە کە بڕوابوون بەوەی کە بوونەوەر لەسەر بنچینەی زانیاری ڕۆنراوەو بەگوێرەی چەند یاسایەکی ژیرانەی ڕێک وپێک بەڕێوەدەچێ ، نەک هەر مرۆڤ بێ ئیحتیاج ناکات لەوەی بڕوا بە خودایەکی بەدیهێنەرو پەروەردگار بێنێ ، بگرە ئەو جۆرە قەناعەت و بڕوایە وای لێ دەکات کە بەناچاری بڕوا بە خودایەکی زاناو تواناو کاربەجێو میهرەبان بێنێ .

کەواتە ئەو قسە بێ سەرو پێیەی کە ماددەپەرست و خوانەناسەکان وەک تووتی دوو جارو سێ جار دووبارەی دەکەنەوەو بەسەر زاریانەوە بۆتە بنێشتە خۆشکە قسەیەکی بێ پشت و پەناو بێ بنچینەیەو ، پارەی قەڵبەو سەر بە خاوەنیەتی !

بەڵێ قسەیەکی زۆر باوو دووپاتکراوەی بێ بڕوایان ئەوەیە کە : کاتی خۆی بۆیە مرۆڤ بڕوای بەخوا هێناوە چونکە نەزان بووەو شارەزای یاساو دەستوورو نهێنییەکانی سروشت و بوونەوەر نەبووەو ناچاربووە بۆ تەفسیرکردنی چۆنیەتی پەیدابوونی بوونەوەرو ڕوودانی دیاردە سروشتییەکان پەنا بەرێتە بەر هێزێکی نادیار بەناوی ( خودا ) !!

بەڵام دوای ئەوەی زانیاری بەرەوپێش چوو و مرۆڤ توانی پەردە لەسەر ڕازو نهێنییەکانی سروشت لابدات و پەی بە یاساو دەستوورەکانی بەرێ ، بۆی ساغ بۆوە کە بۆ تەفسیر کردنی چۆنیەتی دروست بوون و بەڕێوەچوونی بوونەوەر حەوجێی بەخوا نیە ! چونکە هەموو شتێک کە پەیدادەبێو ڕوودەدات حەتمەن هۆیەکی دیاری کراوی هەیەو ، مرۆڤ دەتوانێ لەڕێی

تێفکرین و سەرنج دان و لێکۆڵینەوەوە پەی بەو هۆیانە بەرێ و بیان دۆزێتەوە .

جا ئێمە بۆ خستنەڕووی پووچەڵیو بێ کاکڵی ئەم ورێنەیە کە زۆرکەسی بەناوخوێندەوارو ڕۆشنبیری پێ لەخشتە چووەو سەرەنگرێ بووە ، چەند خاڵێک دەخەینەڕوو :

١- بڕوابوون بە هۆیەکان ( الأسباب ) ، ئاقڵ مەندانی دنیا تێیدا بەشدارن و شتێک نیە بەس لەسەر بێ بڕوایان تاپۆ کرابێو ، کالاّیەک نیە بەس بە بالاّی وان بڕابێ !

ئەوەتا خوای زانا کە بەسەرهاتی ( ذو القَرْنَيْن ) مان بۆ دەگێڕێتەوە دەفەرموێ : ( إنّا مَكَّنّا لَهُ في الأَرْضِ وآتَيْناهُ مِنْ كُلِّ شَيْءٍ سَبَباً .. ) الكهف / ٨٤ . واتە : ئێمە دەستەڵاتدارمان کردبوو لە زەوی دا ، وە بۆ هەموو شتێک هۆیەکمان دابۆیە ..

وەک دەبینین خوای قسەلەجێ ، دامەزران و فەرمانڕەوایەتی کردن لەزەوی دا لەگەڵ دەستگەیاندنە هۆ ( سبب ) یەکان لێک دەبەستێ ، واتە مرۆڤ لەڕێی زاڵ بوونی بەسەر هۆیەکانی سروشت دا ، دەست بەسەر زەوی دا دەگرێ و تێیدا سەقامگیر دەبێ .

دیسان ڕستەی ( لكل شيء سبب ) قسەیەکە مسوڵمانە عەوامەکانیش بەسەر زاریانەوەیە !!

٢- بڕوادارو خواناسان نەک هەر نکووڵییان لەوە نیە کە بوونەوەر ڕێک وپێک و یاسادار ( منظم ) ە ، بەڵکو یاساداری و ڕێک وپێکی بوونەوەر بە پتەوترین بەڵگەی سەلماندنی بوونی خودا لەقەڵەم دەدەن !

بەڵێ لەڕاستیدا باباى بڕوادار لە هەموو کەس پتر پێداگیری لەسەر یاساداری و پڕ وردەکاری سروشت و بوونەوەر دەکات ، چونکە ئەو - باباى بڕوادار - بوونەوەر بە پەرێزو شوێنەواری خودایەکی ئەوتۆ لەقەڵەم دەدات کە خاوەنی ئەوپەڕی زانیاری و تواناو کاربەجێیی یە ، ئەوە هەمووی لەلایەکەوە ، لەلایەکی دیکەشەوە قورئانی مەزن لە چەندان ئایەتدا خستوویەتەڕوو کە لە بوونەوەردا هیچ جۆرە نالێکی و بێ یاساییەک بەدی ناکرێ و ، هەرچی کە لە بوونەوەریشدایە گچکە بێ یان گەورە ، ئەندازەگیری کراوەو بە ئەندازەو شێوەو چۆنیەتییەکی تایبەتی دروستکراوە ، وەک فەرموویەتی : ( إِنَّا كُلَّ شَيْءٍ خَلَقْنَاهُ بِقَدَرٍ ) القمر /٤٩ واتە : ئێمە هەموو شتێکمان بە ئەندازە خوڵقاندوە .

دیسان فەرموویەتی : ( وَإِنْ مِنْ شَيْءٍ إِلاَّ عِنْدَنَا خَزَائِنُهُ وَمَا نُنَزِّلُهُ إِلاَّ بِقَدَرٍ مَعْلُومٍ ) الحجر / ٢١ . واتە : وە هیچ شتێک نیە کە عەمبارەکانی لای ئێمە نەبن ، وە بە ئەندازەی دیاری کراو نەبێ نایتێربنەخوارێ .

وە فەرموویەتی : ( وَخَلَقَ كُلَّ شَيْءٍ فَقَدَّرَهُ تَقْدِيراً ) الفرقان /٢ واتە : وە هەموو شتێکی دروستکردوە ، جا ئەندازەی گرتوە بە ئەندازەگیری .

جا ئێستا پاش ڕوونکردنەوەی خاڵی یەکەم و دووەم ، کە

وەک دوو پێشەکی ( مُقَدِّمَة ) وابوون ، دەتوانین بچینەسەر خاڵی سێیەم کە ئەنجامی سروشتی دوو خاڵی پێشەوەیە بە ڕاشکاوی بڵێین :

٣- تێکگیرانی بڕوابەخوا بوون و بڕوابوون بە یاساداری بوونەوەر ئەفسانەیە :

بەڵێ ئەو قسەیەی کە دەڵێت بڕوابوون بەوە کە خوا بەدیهێنەرو مشوورخۆری بوونەوەرە ، لەگەڵ بڕوابوون بەوە کە بوونەوەر هەمووی لەسەر بنچینەی زانیاری دروستکراوەو بەپێی چەند یاسایەکی وردی ژیرانە بەڕێوەدەچێ ، پێکەوە دژن و تێک دەگیرێن ، قسەیەکی ئەفسانەیەو لە دنیای بەڵگان دا ڕووت و ڕەجاڵ و بێ پشتیوانە ، چونکە :

یەک : ئایا بەڕێوەچوونی شتێک بەپێی چەند یاسایەک بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کەس دروستی نەکردوە ؟!

دوو : یاخود ئایا پەی بردن بە چۆنیەتی کارکردن و بەڕێوە - چوونی شتێک بەسە بۆ تەفسیرکردنی چۆنیەتی پەیدابوونیشی ؟!

سێ : یان ئایا وەڵامدانەوەی پرسیاری ، ئەمە چیە (ماذا هُوَ؟) دەشبێتە وەڵام بۆ پرسیاری ، ئەوە چۆن پەیدابووە ؟ (كَيْفَ وُجِدَ هذا ؟!) ، بێگومان نەء نەء نەء ، چونکە :

ا- بەڕێوەچوونی شتێک بەپێی چەند یاسایەک لەلای هەموو ژیرو تێگەیشتوویەک بەڵگەیە لەسەرئەوەی بەدیهێنەرو ڕێکخەرێکی هەیە ، ئاخر ڕێک وپێکی بەڵگەیە لەسەر ڕێکخەرێک ( النِّظامُ يَدُلُّ علىٰ المُنَظِّمْ ) . کەسێکیش شێت

نەبووبێ ، نالێ چونکە تەلەفزیۆن و کاتژمێرو بەفرخەرەوە ( ثلاجە ) وردەکاری و یاسایان پێوەدیارە ، کەس دروستی نەکردوون !!

٢- وە پەی بردن بە چۆنیەتی کارکردن و بەڕێوەچوونی شتێک بەس نیە بۆ تەفسیرکردنی چۆنیەتی پەیدابوونیشی ، چونکە هەموو پەیدابوویێک پەیداکەرێکی هەیەو ، بۆ دۆزینەوەی پەیداکەری هەر شتێکیش دەبێ لەدەرەوەی جوغزی ئەو شتەدا بگەڕێین .

٣- وە وەلامدانەوەی پرسیاری ، ( ئەمە چیە ؟ ) ناگونجێ ببێتە وەلامی پرسیاری ؛ ( ئەمە چۆن پەیدا بووە ؟ ) چونکە بە پەی بردن بە حەقیقەتی شت و ناسینی زاتی ، مەرج نیە پەی بە پەیداکەرو سەرچاوەی بوونیشی ببردرێ .

کورتەی مەبەست :

ئەوە کە ئێمە دەزانین بوونەوەر چیەو چۆن کاردەکاو بەڕێوەدەچێ ، بێ ئیحتیاجمان ناکات لە بڕواهێنان بە خودای بەدیهێنەر ، چونکە ئەو زانین و زانیاریە بەس واقیعی ئێستای بوونەوەری پێشان داوین ، بەلام بۆی نەخستووینەڕوو ئەو واقیعە چۆن پەیدابووەو ئەو ڕێک وپێکیو وردەکاریە کێ هێناویەتەدی !

ئنجا هیچ بڕوادارێکیش نەیگوتوە بڕوابەخوا بوون وام لێ دەکات بڕوا بە ڕێک وپێکیو یاساداری بوونەوەر نەکەم .

چونکە بڕوادار لەپێش خەڵکی دیکەدا بڕوای وایە خوا جَلَّ جَلالُه هەموو شتێکی بەپێی زانیاری بەکی قووڵ و بێسنوورو چەند یاسا و دەستوورێکی بەکجار پڕ وردەکاری خوڵقاندوەو بەڕێوەی دەبات .

واتە :

باباى خواناس کە دەڵێ: خودا باران دەبارێنێ و درەخت و شیناورد دەڕوێنێو .. هتد مەبەستی ئەوە نیە کە خودا بەبێ هۆو بەبێ نەخشەو بەرنامە ئەو کارانە ئەنجامدەدا ، بەڵکو مەبەستی ئەوەیە کە ئەو یاسا و دەستوورو نەخشەیەی ئەو دیاردانەی پێ هاتوونەتەدی و بەڕێوەدەچن لەلایەن خواوە دانراون ، کەواتە سەرەنجام هەر شتێکیش زادەی وان بێ زادەو بەرهەمو دروستکراوی خوای بەدیهێنەرو پەروەردگارە[1] !

مادام وابێ :

نە بڕوابەخوا بوون بێ ئیحتیاجمان دەکات لە بڕواهێنان بە یاسا و دەستوورەکانی بوونەوەر ، وە نە ناسین و دۆزینەوەی ڕازو نهێنیو یاساکانی بوونەوەرو پەی بردن بە چۆنیەتی کارکردن و بەڕێوەچوونی بێ ئیحتیاجمان دەکات لە بڕوابەخوا هێنان .

بەڵکو بەپێچەوانەوە هەرکام لەم دووانە ئەوی دیکە پەلکێش دەکات ، بڕوابەخوا بوون وامان لێ دەکات بڕوا بە ڕێک وپێکیو یاساداری بوونەوەر بێنین ، چونکە خوای زاناو تواناو کاربەجێ هەر وای لێ چاوەڕوان دەکرێ کە

---

(١) بێگومان ئەگەر گریمان مسوڵمانێکیش هەبێ بڕوای بە زانیاری و یاساکانی سروشت نەبێ ، ئەوە تاوانەکە بەسەر ئی نەفامیی خۆیەتیو ئیسلام وای فێرنەکردوە .

دروستکراوی خۆی بەپێی چەندان یاسای وردو زیرانەو بە ڕێک وپێکی بخولێنێ .

وە ناسین و دۆزینەوەی ڕازو نهێنیو یاساکانی سروشت و بوونەوەرو پەی بردن بە چۆنیەتی کارکردن و بەڕێوەچوونی ، وامان لێ دەکات کە بڕوا بە خودای زاناو تواناو کارزان بێنین ، چونکە یاسا بێ یاسادانەرو ڕێک وپێکی بێ ڕێکخەرو کارکردن و بەڕێوەچوون بێ کارگێڕو بەڕێوەبەر هاتنەدی یان مەحاڵە .

ئێستاش دەچینە سەروکاری مەسەلەی دووەم :

# دووەم
# سەلماندنی بوونی خوا

لەبەرئەوەی ئێرە جێی تەرخان کراوی سەلماندنی بوونی خودا نیە ، بەس تاقە بەڵگەیەک لەنێو دەیان بەڵگەی درەوشاوەدا بەنموونە دێنینەوە لەسەر ئیسپاتی بوونی خودا . ئەو بەڵگەیەش بەم شێوەیە دەخەینەڕوو :

ئەگەر سەرنج لە ئینسان بدەین کە یەکێکە لەو گیانلەبەرانەی لە بوونەوەردا دەژین دەبینین خاوەنی ویست و تواناو زانیاری و ژیان و دیتن و بیستن و قسەکردن و پێکەنین و گریان و تووڕەبوون و بەزەیی و ... هتد .

جا ئێستا با سەرنج بدەین داخوا ئینسان لە چ سەرچاوەیەکەوە هاتوەو کێ هێناویەتەدی ؟!!

یاسایەکی ژیربێژی ( منطقي ) هەیە دەڵێ :
نەدار پێی نابەخشرێ ( فاقِدُ الشَّيءِ لايُعْطي ) .

کەواتە حەتمەن دەبێ ئەو سەرچاوەیەی ئینسانی لێوە هاتوەو ئەو زاتەی ئینسانی دروستکردوە ، خاوەنی هەموو ئەو خەسلەتانە بێت کە لە ئینسان دا هەن ، واتە ئەو یان ئەو سەرچاوەیەی کە دروستکردنی وەپاڵ دەدەین دەبێ خاوەنی ژیان و ویست و توانا و زانیاری و دیتن و بیستن و قسەکردن و تووڕەیی و بەزەیی بێت .

جا با سەرنج بدەین داخوا ئەو سەرچاوەیە یان ئەو زاتە کێ یە ؟!

لەڕاستیدا بۆ دیاری کردنی ئەو سەرچاوەیە بەس سێ ئیحتیمال ڕێ یان تێ دەچێ :

١ـ کە بڵێین سەرچاوەی دروستبوونی مرۆڤ خوای پەروەردگارە .

٢ـ کە بڵێین سەرچاوەی دروستبوونی مرۆڤ خودی خۆیەتی .

٣ـ کە بڵێین سەرچاوەی دروستبوونی مرۆڤ شتێکی دیکەیە غەیری خوداو غەیری مرۆڤ .

هەڵبەتە ئەوەی کە ڕاست و واقیعی بێ و بەڵگە پشتگیری بکەن بەس ئیحتیمالی یەکەمیانە ، بەڵام با جارێ بچینە سەروکاری ئیحتیمالی دووەم و سێیەم ، چونکە کە سەلمێنرا ئەوان شتاقیان ڕاست نین و پووچو هەڵەن ، ئەوەمی بە ناچاری بمانەوێ و نەمانەوێ ناچاردەبین دان بە ڕاستیی ئیحتیمالی یەکەمدا بێنین .

